

# ١٠٠٠ سوننەت لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەو و ڕۆژدا



نووسینی : خالد الحسینان

وەرگێڕانی : سەربەست جەباری

# هەزار سوننەت

# لە سوننەتەكانى پێغەمبەرى خوا ﷺ

# لە شەو و ڕۆژێكدا

نووسينى

خالد الحسينان

وەرگێرانى

سەربەست جەبارى

# پێشەكى نووسەر

الحمد لله الرحيم الغفار ، الكريم القهار ، مقلب القلوب والأبصار ، عالم الجهر والأسرار ، احمده حمدا دائما بالعشي والأبكار ، واشهد أن لا اله إلا الله وحده لا شريك له ، شهادة تنجي قائلها من النار ، واشهد أن محمـــدا نبيه المختار صلى الله عليه و وعلى أهله وأزواجـــه وأصـــحابه الجـــديرين بالتعظيم والأبكار، صلاة دائمة باقية بقاء الليل والنهار.

اما بعد : بێگومان باشترین شتێك كە پێویستە مسولمان گرنگى پێبدات لە ژیانى ڕۆژانەیدا بریتى‌یە لـەكاركردن بەسوننەتى پـیرۆزى پێغەمبــەر ﷺ لەهــەموو هــەڵس وكــەوت و گوفتــار و كردارێكــى‌دا بەشــێوەیەكى وا كەهــەموو ژیــان و جموجــوڵێكى ڕێــك بخــات و بگوزەرێنێ لەســەر سوننەت و ڕێبــازى بــەڕێز پێغەمبــەر ﷺ هــەر لەوكاتــەوەى كــە لەخــەو هەڵدەســتێت تــاوەكو ئێــوارەى لێــدێت وپاشانیش نووستنى.

ئیمامى "**ذو النون المصري**" دەفــەرمێت (**من علامة المحبة لله عز وجل متابعة حبيبه ﷺ في أخلاقه وأفعاله وأوامره وسننه**) واتە/ یەكێك لەنیشانەكانى خۆشویستنى خواى گــەورە بریتى‌یــە لــە شــوێنكەوتنى خۆشەویســتەكەى ﷺ لەهــەموو ئاكــار و كــردار و فــەرمان و ســوننەتەكانى . خــواى گــەورە دەفــەرمێت ﴿قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر الله لكم ذنوبكم والله غفور رحيم﴾ آل عمران ٣١ ، واتــە/ ئــەى پێغەمبــەر ﷺ پێیــان بفــەرموو : ئەگــەر ئێــوە

خواتـان خـۆش دەوێـت شـوێنی مـن بکـەون و لەفـەرمانی مـن دەرمەچن، ئـەو کاتـە خـوایش ئێـوەی خـۆش دەوێـت و لـەگوناح و هەڵەکانیشـتان خـۆش دەبێـت، چـونکە ئەوخوایـە لێخۆشـبوو و میهرەبانە .

شـێخ حەسـەنی بەصـری _ ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت_ دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت (**فکان علامة حبهم اياه اتبـاع سنة رسـوله** ) واتـە/ جـا بێگومـان خـۆش ویسـتنی بەندەکان بـۆ خـوای گەورە بریتییە لە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ .

گومانی تێدا نییـە کـە ڕێـز و پلـە وپایـەی ئیمانـدار بـە پـێی شوێنکەوتنێتی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ ، هـەر کاتێـك سـوننەتێك زیـاتر جێبەجێ بکات ئەوە لای خوای گەورە پلەی بـەرزتر و ڕێـزی زیـاتر دەبێت .

بۆیـە منـیش بەپێویسـتم زانـی کەئـەم پوختەیـە کۆبکەمـەوە دەربارەی ئەو سوننەتانەی کە لەشەو وڕۆژدا دووبـارە دەبنـەوە بـۆ زیـاتر زیندوکردنـەوەی سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ لـە واقیـع وژیـانی ڕۆژانـەی موسـڵمانانـدا لـەعیبادەت وپەرسـتنیاندا و لەخـەوتن وهەستانیاندا و لـە خـواردن و خواردنەوەیانـدا لەهـەڵس و کـەوتیان لەگـەڵ خـەڵکیدا ،لـەپاك و خاوێنیانـدا و لەپۆشـینیاندا و لەهـەموو سات وکاتێکیاندا .

ئەگەر بێت و وورد بینەوە لـەوەی کـە ئەگـەر یـەکێك لـە ئێمـە ئەندازەیەك مـاڵی لێ وون بێـت چـەندێك خـۆی بـۆ مانـدوو دەکـات و

هەوڵ و كۆششی زۆر دەكات بۆ دۆزینەوەو بەدەست هێنانەوەی ، بەڵام زۆر سوننەت هەن كە لێمان ون بوون و لێی بێئاگاین ، بەڵام هیچ غەم و خەفەتێك و هەوڵ و كۆششێكمان نییە بۆ گەڕان و دۆزینەوەو فێربوونیان و جێبەجێكردنیان !!! . جا یەكێك لەو بەڵاو موسیبەتانەی ڕووی تێكردووین وپێوەی دەناڵێنین ئەوەیە كە هەریەك لەئێمە پارەو پوڵی زۆر بەلاوە گرنگتر وبایەخدارترە لە سوننەتەكانی پێغەمبەر ﷺ. ئەگەر بێتوو بەخەڵكی بووترێت كێ سوننەتێك لەسوننەتەكان جێبەجێ بكات لەبەرامبەردا ئەندازەیەك ماڵ یان پارە وەردەگرێت ئەوە دەبینین كە كەسانێكی زۆر هەوڵ دەدەن بۆ جێبەجێكردنی سوننەتەكان هەر لەبەیانییەوە تاوەكو ئێوارە مادام لەبەرامبەر ئەو جێبەجێكردنەدا قازانج و پارەوپوڵ وەردەگرن ، بەڵام ئایا ئەو پارەوپوڵە چ سوودێكی هەیە كاتێك كە مرۆڤ كرایە ناو گۆڕەوەو خاكی بەسەردا كرا ، خوای گەورە دەفەرمێت ﴿**بل تؤثرون الحياة الدنيا والآخرة خير وأبقى**﴾ الأعلى ١٦-١٧ ، واتە/ بەڵكو خەڵكینە ئێوە زیاتر ژیانی دونیاتان مەبەستە و بەگرنگتری دەزانن لەكاتێكدا قیامەت و بەدەست هێنانی بەهەشت چاكترە وبەردەوامیشە .

دیارە مەبەست لەم سوننەتانەش كەلەم نامیلكەیەدا هاتوون ئەوەیە كە جێبەجێكردنیان دەبێتە هۆی وەرگرتنی پاداشت ، بەڵام جێبەجێنەكردنیان نابێتە هۆی سزا وتۆڵەسەندن ، هەروەها

ئەو سوننەتانە هەر هەموو لەشەوو ڕۆژێکدا دووبارە دەبنەوە ، بۆیە هەریەك لەئێمە دەتوانێت زۆر بەئاسانی جێبەجێیان بکات .

گومان لەوەدا نییە کە هەریەك لەئێمە دەتوانێت لەشەوو ڕۆژێکدا (١٠٠٠) سوننەت جێبەجێ بکات ئەگەر مەبەستی بێت زۆر بەئاسانی ، وە نووسینی ئەم نامیلکەیەش هۆکارێکی ئاسانە بۆ جێبەجێکردنی ئەو هەزار سوننەتە و زیاتریش .

کەوابوو ئەگەر بێت وەهەر موسڵمانێك لەشەو و ڕۆژێکدا سوور بێت لەسەر جێبەجێکردنی هەزار سوننەت ئەوە لەمانگێکدا دەکاتە سی هەزار (٣٠٠٠٠) سوننەت کە خێر وپاداشتی ئەو سی هەزارەی بۆ دەنووسرێت .

دەبێت چەندە نەفام وزەرەرمەند بێت ئەو کەسەی کە بێئاگابێت لەم سوننەتانە و نەیانزانێت یان بیانزانێت و جێبەجێیان نەکات ، چەند پلە وپاداشتی زۆری بەفیڕۆ زایە داوە و چەند خۆی بێبەش کردووە لەو هەموو خێر و پاداشتە .

ئاشکرایە کە پەیوەست بوون بە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك سوود و قازانجی زۆر گەورەی هەن لەوانە :-

١. گەیشتن بەپلەی خۆشەویستی، خۆشویستنی خوای گەورە بۆبەندەی خۆی .

٢. پڕکردنەوەی ەو ئەو کەم وناتەواویانەی کە لەفەرزەکاندا بوون .

٣. پارێزراوبوون و دوورکەوتنەوە لەداهێنراوەکان (البدع).

٤. بێگومـــان جیاّبـــەجێکردنی ســـوننەتەکان نیشـــانەی بەگەورەزانین و مەزن تەماشاکردنی دروشمە(شعائر)ەکانی خوای گەورەیە .

کەوابوو ئەی ئوممەتی ئیسلام تەقوای خواتان هەبێت بەرامبەر سوننەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ ، وەهەوڵ بدەن زیندوویان بکەنەوە لەواقعی ژیانتاندا ، ئەگەر وانەکەین دەبێت کێ هەبێت جگە لەئێمە ئەو سەننەتە مەزنانە زیندوو بکاتەوە .

بێگومـان زیندووکردنـەوەی ئـەو سـوننەتانەش نیشانە و بەڵگەی خۆشەویستنی تەواو و شوێنکەوتنی سەرڕاستانەیە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ .

## سوننەتەکانی هەستان لەخەو

١. لابردنـی شـوێنەواری خـەو بەدەسـت لـەدەم و چـاو ، هەریـەك لـەئیمامی ئـیبن حەجـەر و نـەوەوی _ ڕەحمـەتی خودایان لێبێـت_ فەرموویانـە سـوننەتە و ئـەم فەرموودەیـەش بەبەڵگـە هێنراوەتەوە ( **فاستيقظ رسول الله ﷺ فجلس يمسح النوم عن وجهه بيده** ) رواه مسلم واتـە/ پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەخـەو هەسـتا و دانیشـت و بەدەسـتی پـیرۆزی شـوێنەواری خـەوی لەسـەر ڕووی پیرۆزی لادەبرد .

٢. دوعا و پاڕانەوە بەم شێوەیە (**الحمد لله الذي أحياننا بعدما أماتنا واليه النشور**) رواه البخاري ،واتە/ هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ ئەو خوایەی کە دوای ئەوەی مراندبوونی زیندووی کردینەوە و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە .

٣. سیواك کردن :- پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك لەخەو هەڵدەستا سیواکی بەدەمی پیرۆزیدا ئەهێنا ، هەروەك لەصەحیحی بوخاری وموسلیم دا هاتووە .

٤. منگ کردن (**الاستنثار**) :- پێغەمبەری خودا دەفەرمێت ﷺ (**إذا استيقظ أحدكم من منامه فليستنثر ثلاثا فان الشيطان يبيت على خيشومه**) متفق عليه ، واتە/ ئەگەر یەکێك لەنێوە لەخەو هەستا با سێ جار منگ بکات چونکە شەیتان شەو لەناو لووتیدا دەمێنێتەوە .

٥.شۆردنی هەردوو دەستی سێ جار پێش دەست خستنی لەشتی تر ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمێت:- (**اذا استيقظ أحدكم من نومه فلا يغمس يده في الإناء حتى**

سوننەتەکانی چوونە سەرئاو وهاتنەدەر لێی

**يغسلها ثلاثا**) متفق عليه ، واتە/ ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەخەو هەستا با دەستی نەخاتە ناو هیچ قاپ و قاچاخێکەوە تاوەکو سێجار دەیان شوات .

تێبینی/ دیارە سوننەتی دیکەش هەن بەڵام نووسەر هەر ئەوەندەی باس کردووە بۆ زیاتر شارەزایی بوونیش دەتوانن تەماشای ئەم پەرتووکانە بکەن:.

١. پەرتووکی (**الأذكار**)ی ئیمامی نەوەوی .
٢. پەرتووکی (الواصل الصيب)ی ئیمامی ئیبن ولقەیم .
٣. پەرتووکی (**تحفة الذاكرين**)ی ئیمام شەوکانی .
٤. پەرتووکی (زیکری خواناسان) ی حبيب محمد سعيد.
٥. (قەڵای موسڵمان)ی وەرگێردراوی حەمزە بەرزنجی .

١. پێشخستنی قاچی چەپ لەکاتی چوونە ژوورەوە، وە قاچی ڕاست لەکاتی هاتنەدەر .

٢. کاتێك ویستی بچێتە سەرئاو بڵێت ( **اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث** )متفق عليه ، واتە/ خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لە شەیتانی نێر و مێ

٣. کاتێک دێتەدەر دەڵێت (**غفرانك**) اخرجه اصحاب السنن الا النسائي ،واتە/ خوایە لێم خۆش ببە .

دیارە مرۆڤ ڕۆژانە چەند جارێك سەرئاو دەکات هەر جارەش چوار سوننەت هەیە ئەگەر جێبەجێیان بکات ، دوو سوننەت لەکاتی چوونە سەر ئاو و دووانیش لەکاتی هاتنە دەرەوە .

# سوننەتەکانی دەست نوێژ

١. ووتنی "بسم الله" .

٢. شۆردنی هەردوو دەست لەسەرەتاوە .

٣. ئاو لەدەم و لووت وەردان پێش شۆردنی دەم وچاو .

٤. مەنگ کردن و ئاو لەلووت فڕێدان بەدەستی چەپ ، لەو فەرموودەیەی کە باسی چۆنێتی دەست نوێژی پێغەمبەر ﷺ دەکات هاتووە ( **فغسل كفيه ثلاث مرات ، ثم تمضمض ، واستنشق ، واستنثر ثم غسل وجهه ثلاث مرات** ) متفق عليه . واتە/ پاشان هەردوو دەستی سێجار شۆرد ، پاشان ئاوی لەدەم و لووتی وەردا و فڕێیدا ، پاشان دەم و چاوی سێجار شۆرد .

٥. زۆر ئاو لەدەم و لووت وەردان بۆ غەیری ڕۆژووان ، لە فەرموودەیەك دا هاتووە ( **وبالغ بالاستنشاق إلا أن تكون صائما** ) اخرجه الاربعة ،واتە/لەئەندازە بەدەر ئاو لە لوتت وەربدە ، تەنها ئەگەر بەڕۆژوو بووی وامەکە ، دیارە ئاو لەدەم وەردانیش هەر وایە .

٦. ئاو لەدەم و لوت وەردان بەیەك مشت ئاو بەشێوەیەك کە مشتێك ئاو بەکاربێنێت بۆ هەردووکیان ، هەروەك لەشێوەی چۆنێتی دەست نوێژگرتنی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە .

٧. سیواك کردن : پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرمێت ( **لولا أن اشق على أمتي لأمرتهم بالسواك مع كل وضوء** ) رواه احمد والنسائي ، واتە/ ئەگەر لەبەر ناڕەحەت کردن و ماندووکردنی ئومەتەکەم

نەبوایە فەرمانم پێدەكردن بەسیواك كردن لەگەڵ هەموو دەست نوێژێكدا _واتە فەرزم دەكرد_ .

٨. دەست خستن لە ڕیشی پڕ (**كان رسول الله ﷺ يخلل لحيته في الوضوء**) أخرجه الترمذي واتە/پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی دەخست لەڕیشی لەكاتی دەست نوێژدا _دیارە ڕیشی پێغەمبەر ﷺ زۆر و پڕ بووە_ .

٩.چۆنێتی مەسح كردنی سەر ،سوننەت وایە بەم شێوەیە مەسحی سەری بكات : هەردوو دەستی تەڕ بكات لەپێشی سەرییەوە دەست پێبكات بەرەو پشتی ملی ، پاشان بیانگێڕێتەوە بۆ پێشەوە .بەڵام ئەوەی كە فەرزە ئەوەیە كە مەسحی هەموو سەری بكات [٢] بەهەر شێوەیەك بێت (**مسح رسول الله ﷺ برأسه فأقبل بيده وأدبر**) متفق عليه ، واتە/پێغەمبەری خودا ﷺ مەسحی سەری كرد هەردوو دەستی لەپێشەوە دانا و پاشان بردی‌یە دواوە .

١٠. دەست خستنە نێو پەنجەكانی دەست و پێ (**أسبغ الوضوء وخلل بين الأصابع**) أخرجه الأربعة ، واتە/ دەست نوێژی تەواو و ڕێك وپێك بكەرەو دەستیش بخە نێو پەنجەكان .

١١. لەڕاستەوە دەست پێكردن لەهەموو كردارەكاندا (**كان رسول الله ﷺ يعجبه التيمن في تنعله وترجله وطهوره وفي شأنه كله**) متفق عليه ،واتە/ پێغەمبەری خودا ﷺ پێی خۆش بوو لای

ڕاستی پێشبخات لەکەوش لەپێکردنی و سەرداهێنانی و پاککردنەوەی و هەموو کارێکی .

١٢ . سێ جار سێ جار شۆردنی ئەندامەکان . دیارە ئەمیش چەند فەرمودەیەکی لە سەرن.

١٣. ووتنی شایەتمان لە کۆتایی دا و خوێندنی نزاو پاڕانەوەی دوای دەست نوێژ بەم شێوەیە : . **اشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له واشهد ان محمدا عبده ورسوله اللهم اجعلنى من التوابين واجعلنى من المتطهرين** ) ـ رواه مسلم واصحاب السنن .

١٤ ( واتە : بەدڵ قەناعەتم وایە و بەزاریش دەیڵێم و بەکردەوەش دەیسەلمێنم که بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین و تەنیا یە و هیچ هاوەڵی نین وە موحەممەد بەندەو ڕەوانە کراوی خوایە ، ئەی خوایە بمگێڕە لە باش گەڕاوان و بمگێرە لە پاکبووەوان) دیارە هەرکەسێك ئەم دوعایە بخوێنێت ئەوە هەر هەشت دەرگاکانی بە هەشتی بۆ دەکرێنەوە و لە هەرکامێکیانەوە حەز بکات دەچێتە ژوورەوە . هەروەك لە صحیحی مسلم دا هاتووە .

١٤ . دەست نوێژگرتن لە ماڵەوە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( **من تطهر فى بيته ثم مشى الى بيت من بيوت الله ليقضى فريضة من فرائض الله ، كانت خطوتاه احداهما تحط خطيئته والاخرى ترفع درجته** ) رواه مسلم . واتە هەرکەسێ لە ماڵەوە خۆی پاك بکاتەوە ـ واتە دەست نوێژ بگرێ ـ

وبە پاكى بچێت بۆ مـاڵێ لـە ماڵـەكانى خـوا بـۆ ئـەوەى فـەرزێ لـە فەرزەكانى خوا بـەجێ بهێنێـت ، ئـەوە هـەر هـەنگاوێ دەنـێ بـە يـەكێكى گونـاهێكى لێ هەڵـدەوەرێ وبەيێكـەى تـرى پلەيـەك بەرزدەبێتەوە).

١٥. (( الـدلك ) دەسـت پێـدا هێنـان و لێ خشـاندنى ئەندامـەكانى نوێژ[1]

١٦. زيـادە رۆيـى نـەكردن لـە بـەكارهێنانى ئـاودا (( **كـان** ﷺ **يتوضا بالمد** )) متفق عليه واتە : پێغەمبەرى خوا (ﷺ ) بە (مد) يێك ئاو واتە پڕ هەردوو دەستى دەستنوێژى دەگرت .

١٧ . بـەزيادەوە شـۆردنى دەم و چـاو و دەسـت و پـێ يـەكان چونكە ابـو هريـرە - ڕەزاى‌خـواى لێ بێـت - جارێكيـان دەسـتنوێژى گرت كاتێك دەستەكانى شۆرد قۆڵەكانيشى پێوە شۆرد و كاتێكيش پێيەكانى شۆرد قاچەكانيشى پێـوە شـۆرد و لـە كۆتـايى دا ووتـى پێغەمبەرم (ﷺ ) بينى بەم شێوەيە دەست نوێژى گرت .

١٨ . دوو ڕكات نوێژى دەسـتنوێژ لـە دواى دەسـت نوێژەكـەوە ، پێغەمبەرى خوا (ﷺ ) دەفەمويت (( **من توضا نحو وضولى هذا ثم صلى ركعتين لا يحدث فيهمـا نفسـه غفرلـه ماتقـدم من ذ**

[1] زاناكان زۆربەيان دەلك بە سوننەت دەزانـن ، بـەلام ئيمـامى ماليـك و مزنى بە فەرزى دەزانن لە هەركام لەخۆشوردن ودەستنوێژگرتن دا .

ینه)) رواه البخاری و مسلم . واتە :/ هەركەسێك دەسـت نوێـژێكی وەك دەسـت نوێژەكـەی مـن بگـرێ و پاشـان دووڕكـات بكـات كـە دڵەی لێیان دا نەبێ ئەوە لـە گوناهـی پێشـووی دەبووردرێ . لـە ڕیوایەتی ئیمامی مسلم دا دەفـەرموێت ( الاوجبـت لەالجنـە) واتـە : مسۆگەرە كە بەهەشتی بۆ دەبێت .

١٩. بەتـەواوەتی و جـوانی و ڕێـك و پێكـی دەسـتنوێژگرتن (( اسباغ الوضـوء )) واتـە هـەموو ئەنـدامێك لـە ئەندامـەكانی دەسـت نوێژ بە تەواوی و بێ كەم كوڕی بشوات .

❖ئاشكرایە مسوڵمان لە شەوو ڕۆژێكدا چەند جارێك دەسـتنوێژ دەگرێت پێنج جار یان زیاتر

❖كاتێك كە نوێـژە سـوننەتەكان دەكات یـان دەیـەوێت قورئـان بخوێنێت یان هەركارێكی تر كە دەستنوێژگرتن بۆی سوننەتەت بێ، كـەوا بـوو بـەپێ ی دووبـارە و چـەند بـارە بوونـەوەی هـەموو ئـەو سـوننەتانە جێبـەجێ بكـات ئـەوە بێگومـان خێـر و پاداشـتێكی گەورەو زۆری دەست دەكەوێت ، وەك لەم فەرموودانە دا هاتووە :

پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) دەفـەرموێت ( **مـن توضـا فاحسـن الوضوء خرجت خطایاه من جسده حتی تخرج من تحت اظفاره)**

رواه مسلم ـ واتە : هەركەسێك دەستنوێژ بگرێت بەڕێك وپێكی و جوانی ئەوە گوناح و هەڵەكانی لەلاشەی دەردەچێت هـەتاوەكو لـە ژێرنینۆكەكانیەوە دەردەچن .

هـەروەها دەفـەرموێت (( **مـامنكم مـن احـد يتوضـا فيحسـن الوضوء ثم يقوم فيركع ركعتين يقبل بقلبه ووجهه الاوجبت لـه الجنة وغفرله** )) **رواه مسلم**.

واتە : هیچ کەسێك لە ئێوەنی یە کە دەست نوێژبگرێت بە جـوانی و تـەواوی پاشـان هەسـتێت دوو ڕکـات نوێـژ بکـات بـە دڵ و ڕووی تەواوە وە ئەوە مسۆگەر بە هەشتی بۆ دەبێت و لێ ی دەبوردرێـت.

## سـیـــواکـــکـردن

یـەکێك لـەو سـوننەتە پیرۆزانـەی کـە لـە شـەو ڕۆژدا دووبـارە دەبنەوە سیواککردنە ، دیارە چەند کات و شوێنێك هەن لە هـەموو شەو ڕۆژێکدا سیواك تیاکردنیـان سـوننەتە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەربارەی سیواك دەفـەرموێت (( **لولاان اشق على امتى لامـرتهم بـالسواك عند كل صلاة** )) **رواه البخاري و مسلم** . واتـە : ئەگـەر لە بەر نارەحەت بوون و ماندوو کردنی ئوممەتەکـەم نەبوایـە ئـەوە فەرمانم پێ دەکردن بە سیواك کـردن لـە گـەڵ هـەموو نوێژێکـدا . ئەو کات و شوێنانەش کە سیواك تێـدا کردنیـان سـوننەتە لـە شـەو ڕۆژێکـدا ( ٢٠) جـارە لەوانـە : پێـنج نوێـژە فـەرزەکان و سـوننەتە ڕاتبـەکان ، نوێـژی سـوننەتی چێشـتەنگاو ، نوێـژی وەتـر و شـەو نوێژ، کاتی هاتنە ماڵەوە چونکە پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) یەکـەم شت کە کردبێتـی لـە کـاتی هاتنـە مـاڵوەی دا سـیواك کـردن بـووە

هەروەك لە صحیحی مسلم دا هاتووە ، هەروەها لە کاتی قورئان خوێندن دا ، وەلەکاتی ناخۆشی بوونی بۆنی دەم دا ، وە لەکاتی لە خەو هەستان دا ، وەلە کاتی دەستنوێژگرتن دا . بەرهەم و پاداشتی بەکار هێنانی سیواك و جێبەجێ کردنی ئەم سوننەتە :

١. دەبێتە مایەی ڕازی بوونی خوای گەورە لەو بەندەیە.

٢.پاك بونەوەی دەم و دان .

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەفەرموێت (( **السواك مطهرة للفم مرضاة للرب** )) رواه احمد . واتە : سیواك پاك و خاوێن کەرەوەی دەم و ددانەوە و مایەی رەزامەندی خوای پەروەردگارە .

هەروەها زانستی پزیشکی نوێ ئاشکرای کردووە کە سیواك کۆمەڵێ ماددەی زۆر بە سوودی تیدا یە بۆ ددان و پووەکان لەوانە:

١. ماددەی دژە میکرۆبەکان .

٢. ماددەی بۆن خۆش کردنی دەم و ددان .

٣. ماددەی پاککەرەوەی دەم وددان .

---

## سوننەتی لە پێکردنی کەوش

## (( پێڵاو یان نەعل ))

پێغەمبەری پێشەوامان ( ﷺ ) دەفەرموێت ( **اذا انتعل احدكم فليبدا باليمنى واذا خلع فليبدا** بالشمال ، ولينعلها جميعا او

ليخلعهما جميعا )) رواه مسلم واتە ئەگەر یەكێك لە ئێوە كەوشـی لە پێ كرد بالە ڕاستەوە دەست پێ بكات ، وە ئەگەر دایكەند باڵە چەپەوە دەست پێ بكات ، وەیا هەردوو تاكەكان لەپێ بكات یان هەردووكیان دانێت - واتە یەك تاك لەپێ كردن دروست نی یە .

ئەم سوننەتەش ڕۆژانە چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە لە وانە : لە كاتی چوونە ناومزگەوت و هاتنە دەرەوەی لێی، هەروەها لە كاتی چونە گەرماو ( حمام ) و هاتنە دەرەوە لێی ، وە لەكاتی دەرچوون لە ماڵ و هاتنەوە .

ئاشكرایە هەرجارێك لەو جارانە ئەم سوننەتەجێ بەجێ بكات و ئاگای لێبێت و ئومێدی بە پاداشتی پەروەردگار ی هەبێت ئەوە دیارە چەند بارەی بكاتەوە ئەوەندە خێروپاداشتی بۆ دەنوسرێت .

---

## سوننەتەكانی پۆشاك

یەكێكی تر لەو شتانەی كە ڕۆژانە دووبارە و چەندبارە دەبێتەوە لە شەو ڕۆژێكدا لە بەركردن و پۆشینی پۆشاك و داكەندنێتی لەكاتی خەودا یان لە كاتی خۆشۆردن دا یان لە هەركات و شوێنێكی تردا . جا لەم كات و حاڵەدا چەند سوننەتێك هەن كە ئەمانەن : .

١. سوننەت وایە لەكاتی لە بەركردن و داكەندندا بڵێت (( بسم الله ) ئاشكرایە كەناوی خوا هێنان لە هەموو ئیش و كارێك دا سوننەتە هەروەك ئیمامی نەوەوەی دەفەرموێت .

٢. پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كاتێك پۆشاكێكی دەپۆشی - كراس یان شەرواڵ یان مێزەر - دەیفەرموو (( **اللهم انی اسالك من خیره وخیر ماهو له ، واعوذبك من شره وشر ماهو له** )) **رواه ابوداود و الترمذی واحمد و صححه ابن حبان والحاكم -**

واتە : ( ئەی خوایە من داوای خێرو چاكەی ئەم پۆشاكەت لێدەكەم هەروەها ئەو خێرەی كە بۆیەتی ، وە پەنات پێدەگرم لە خراپەی ئەم پۆشاكەو ئەو خراپە یەی كە بۆیەتی) .

٣. لە ڕاستەوە دەست پێكردن لە كاتی لە بەركردن دا: پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەفەرموێت ( **اذا لبستم فابدءوا بایامنكم** )) **رواه الترمذی** وابودلود وابن ماجە - واتە ( هەركاتێك پۆشاكتان لە بەركرد لە ڕاستەوە دەست پێ بكەن )

٤. لە چەپەوە دەست پێ كردن لە كاتی دا كەندن دا

## سوننەتەكانی دەرومالْ كردن

## (( سنن الدخول و الخروج من البیت )) .

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت : سوننەت وایە بۆ ئەوكەسەی كە دەرومالّ دەكات بلّێت ( بسم الله )) وە زۆرزیادی خوای گەورە بكات و پاشان لە كاتی هاتنە مالّەوەی دا سەلام بكات .

١. یادكردن وناوبردنی خوای گەورە لە كاتی هاتنە مالّەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت (**اذا دخل الرجل بيته فذكر الله عند دخوله وعند خروجه وعند طعامه قال الشيطان لامبيت لكم ولاعشاء** ) **رواه مسلم**

- واتە : هەركاتێك پیاوێك - كەسێك - چووە مالّەكەی و ناوی خوای گەورەی هێنا لە كاتی چوونە ژوورەوە و لە كاتی لە مالّ دەرچوونی و لە كاتی خواردنی دا ، شەیتان دەلّێت :لە شەومانەوەو نەخواردنی ئێوارەتان بۆنی یە (( ئەی شەیتانەكان)).

٢. نزاو پاڕانەوەی هاتنە مالّەوە ( **اللهم انی اسالك خير المولج و خير المخرج ، بسم الله ولجنا و بسم الله خرجنا وعلى الله ربنا توكلنا ، ثم يسلم على اهله** ) **رواه ابوداود** . ( ئەی خوای گەورە داوای چاكەی دەرچوون لە مالّ و چوونە دەرلە مالّت لێدەكەم ، بەناوی خوا لە مالّ دەرچووین و بەناوی خوا چوونیە دەر وەپشتمان تەنها بە پەرستراو خوای خۆمان بە ستووە ، پاشان با سەلام لە مالّ و كەس و كارەكەی بكات )

ئاشكراو بێگومانە هەركاتێك بەندە ئەم نزاو پاڕانەوەیە بخوێنێت ئەوە بەردەوام پەیوەندی بە هێزی دەبێت لە گەلّ خوای گەورە و پشت و پەنای هەر خوای گەورە دەبێت

٣. سیواککردن (( **کان ﷺ اذا دخل بیته بدا بالسواك** )) رواه مسلم . واتە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتێک بچوایەتەماڵەوە یەکەم شت که دەستی پێدەکرد سیواك بوو .

٤. سەلام کردن : خوای گەورە دەفەرموێت ( **فاذا دخلتم بیوتا فسلموا على انفسكم تحية من عند الله مباركة طيبة** ) **النور : ٦١** . واتە : ( هەرکاتێك چوونە هەرماڵێك سەلام لە خۆتان بکەن و سەلام لە یەکتر بکەن ، سەلامێك لە لایەن خوای گەورەوە کە پڕە لە بەرەکەت و فەڕ و جوانی و پاکی )

جا ئەگەر گریمان مسوڵمان رۆژانە پێنج جار دەروماڵ بکات واتە تەنها بە ئەندازەی نوێژە فەرزەکان ئەوە ژمارەی ئەو سوننەتانەی کە جێبەجێ یان دەکات دەکاتە (٢٠) سوننەت .

هەروەها سوننەت وایە کاتێك لە ماڵ دەردەچێت بڵێت ( **بسم الله توكلت على الله ولاحول ولاقوة الابالله** ) **يقال كفيت ووقيت وهديت وتنحى عنه الشيطان** ) **رواه الترمذي و ابوداود.**
واتە ( بەناوی خوا ، تەنها پشتم بەخوا بەستووە و هیچ هێز و هەوڵێك نییە ئەگەر کۆمەك و پشتیوانی خوا نەبێت ) هەرکەس وا بڵێت - پێ ی دەوترێت ئەوە بەستەو پارێزەراوی و هیدایەت دراوی، وەشەیتانیش لێی دوور دەکەوێتەوە .

دیارە لە شەو رۆژدا چەند جارێکیش بەندە لە ماڵ دەردەچێت هەر جارێکیش کە دەردەچێت ئەم سوننەتە جێبەجێ بکات ئەوە بێگومان پاداشت و خێرێکی زۆری دەست دەکەوێت .

❖ بەرهەمی جێ بەجێ کردنی ئەم سوننەتە :

١. پەیدابوونی بێناز بوون بۆ بەندە لە هەموو ئەو کێشە و گرفتانەی کە تووشی دەبن .

٢. پارێزرانی بەندە لە هەموو خراپەو نارە حەتیەک چ لە لایەن ئادەمیزادەکانەوە بێت یان لە لایەن جنۆکە کانەوە

٣. ڕێنومای کرانی بەندەو گومڕانەبوونی لە هەموو کاروبارێکی دونیای و قیامەتی دا .

## سوننەتەکانی چوون بۆ مزگەوت

١. زوو چوون بۆ مزگەوت و پەلەکردن بۆ ڕیزی یەکەم و پێشەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان ( ﷺ ) دەفەرموێت

(( **لو يعلم الناس ما في النداء والصف الاول ثم لم يجدوا الا ان يستهموا عليه لاستهموا عليه ، ولو يعلمون ما في التهجير لاستبقوا اليه ، ولو يعلموا ما في العتمة والصبح لاتوهما ولو حبوا** )) متفق عليه - واتە ( ئەگەر خەڵکی بیانزانایە چ پاداشتێك هەیە لە بانگ و ڕیزی یەکەم دا و پاشان نەیانتوانیایە ئامادەی ببن تەنها بەپێشبڕکێ کردن نەبێت ئەوە پێشبڕکێ یان لە سەری دەکرد ، وە ئەگەر بیانزانایە چ پاداشتێك هەیە لە زوو چوون بۆ مزگەوت ئەوە پەلەو پێشبڕکێ یان بۆ دەکرد ، وە ئەگەر بیانزانیایە

ج پاداشتێك هەیە لە نوێژی بەیانی و خەوتنان دا ئەوە ئامادەی دەبوون و بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆلکێ ـ لەسەرسك خشان ـ یش بووایە .

٢. نزاو پاڕانەوەی چوون بۆ مزگەوت (( **اللهم اجعل في قلبي نورا ، وفي لساني نورا ، واجعل في سمعي نورا ، واجعل في بصري نورا ، واجعل من خلفي نورا ، ومن امامي نورا ، واجعل من فوقي نورا ، ومن تحتي نورا ، اللهم اعطني نورا** )) رواه مسلم ـ . واته(( ئەی خوایە لە دڵم دا نور پەیدا بکەی و لە زوبان و بیستن و پاشەوەم و پێشەوەم و سەرەوەم و خوارەوەم دا نور پەیدا بکەی ، ئەی خوایە نورم پێ ببەخشە )

٣. ڕۆیشتن و ڕێکردن بەهێمنی و لەسەرخۆی و هەیبەت و ویقارەوە پێغەمبەری خۆشەویست ( ﷺ ) دەفەرموێت ( **اذا سمعتم الاقامة فامشوا الى الصلاة وعليكم بالسكينة والوقار** ) رواه البخاري و مسلم .

واتە : کاتێك کە بانگ و قامەتتان بیست ئەوە بچن بۆ نوێژ بەڵام بە هێمنی و ئارامی و ویقارەوە ووشەی ((السکنیە لەم فەرموودەیەدا واتە : لە سەرخۆ بوون لە ڕێکردن دا و هەڵەشە نەکردن . ووشەی (( الوقار )) واتە : داپۆشینی چاو لە ئاستی حەرام و بەرزنەکردنەوەی دەنگ و ئاوڕنەدانەوە بەم لاو لادا .

٤.چوون بۆ مزگەوت بە پیادە : زاناکان ووتویانە سوننەتە مسوڵمان هەوڵدات هەنگاوەکانی لەیەکتر نزیك کات و پەلەنەکات لە

کاتی چوونی بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی ئەو خێرو پاداشتی ڕۆیشتن بەپێیەی دەست کەوێت کە لە فەرموودەکاندا هاتووە ، خۆشەویستمان ( ﷺ ) دەفەرموێت ( **الاادلكم على مايمحو الله به الخطايا ويرفع به الدرجات ؟ قالوا : بلى يارسول الله ، وذكرمنها : كثرة الخطاالى المساجد** ) رواه مسلم .

واتە : ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە خوای گەورە گوناح و هەڵەکانی پێ لادەدا و پلە و پایەی پێ بەرز دەکاتەوە ؟

ووتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، یەکێك لەوانە ـ فەرموی : زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت .

٥. نزاوپاڕانەوەی چوونە ناو مزگەوت : سوننەت وایە سوپاسی خوا بکات و صەلاوات لە سەر پێغەمبەر ( ﷺ ) بدات و پاشان بڵێت ( **اللهم افتح لى ابواب رحمتك** ) رواه النسائى وابن ماجه وابن خزيمه وابن حبان ـ واتە : ئەی خوایە دەرگای ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە .

٦. پێش خستنی ڕاست لە کاتی چوونە ناومزگەوت ، ئەنەسی کوڕی مالیك ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ دەفەرموێت (( **من السنة اذا دخلت المسجد ان تبدا برجلك اليمنى و اذا خرجت ان تبدا برجلك اليسرى** ) **اخرجه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبى** ـ واتە : سوننەت وایە کاتێك چوویتە مزگەوتەوە قاچی ڕاستت پێشخەیت هەروەها کاتێك هاتیتە دەر قاچی چەپ پێشبخەیت .

٧. نزاو پاڕانەوەی دەرچوون لە مزگەوت (( **اللهم انی اسالك من فضلك**) رواه مسلم و **زيادة** عند النسائی **يصلی علی الرسول عندالخروج كذلك** . واتە : ئەی خوایە من داوای فەزڵ و بەخششی خۆتت لێدەکەم . لە ڕیوایەتی ئیمامی نەسائی دا دەفەرموێت : صەلآوات لە سەر پێغەمبەر ( ﷺ ) دەدات لە کاتی هاتنە دەرەوەشدا .

٨. پێش خستنی قاچی چەپ لە کاتی هاتنەدەر لە مزگەوت هەروەك لە خاڵی شەش دا فەرموودەکەی ئەنەسمان باس کرد .

٩. نوێژی سلاوکردن لە مزگەوت ( **تحية المسجد** ) پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ ) دەفەرموێت ( **اذا دخل احدكم المسجد فلايجلس حتی يصلی ركعتين** ) ـ متفق عليه ـ واتە ( کاتێ یەکێکتان هاتە مزگەوتەوە با دانەنیشێت تاوەکو دوورکات نوێژی سلاوکردن لە مزگەوت دەکات )

ئیمامی شافعی ـ رەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەفەرموێت :نوێژی سلاوکردن لە مزگەوت لە کاتی ( نەهی ) ش دا هەر دروستە مەبەست لەکاتی ( نەهی ) ـ دوای نوێژی بەیانی تاوەکو رۆژ دەکەوێت هەروەها کاتی وەستانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا وە لە دوای نوێژی عەسر تاوەکو خۆرئاوا دەبێت .

هەروەها شێخی ئیبن حەجەر ـ رەحمەتی خوای لێ بێت / دەڵێت: زانایان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی کە نوێژی سلاو کردن لە مزگەوت سوننەتە .

كەراتــە : كۆى ئـەو سـوننەتانەى كـە مسـولمان جێبـەجێ يـان دەكات لە چوونى بۆ مزگەوت دەكاتـە ( ٥٠) سـوننەت لـە شـەو و ڕۆژێكدا .

## ســـــــــــــوننـــەتەكـــانى بـــانـــگ

ديارە بانگ پێنج سوننەتى هەن هەروەك ئيمامى ئيبن ولقەيم لـە كتێبى ( زادالمعاد ) دا باسى كردووە :

١. ئەوكەسەى كـە گوێ ى لـە بانگـە هەرچـى بانگبێـژ دەڵێـت ئەويش وەكو بانگبێژ بيڵێتەوە تەنها لە كاتى ((**حىعلى الصلاة** ) و ( حـى علـى الفـلاح ) دا نـەبێت بـەڵكو دەڵێـت ((لاحـول ولاقـوە الابالله)) رواه البخارى ومسلم .

بەرهەمى ئـەم سـوننەتە : ئەوەيـە كـە هەركەسـێ جـێ بـەجێ ى بكات چوونە بەهەشتى مسۆگەرە . هـەروەك لـە صـحيحى مسـلم دا هاتووە .

٢. سـوننەت وايـە لـەدواى ووتنـى ( اشـهدان محمـدا رسـول الله ) بڵێت ( **وانـا اشهدان لااله الاالله وان محمدا رسول الله ، رضيت بـالله ربـا وبالاسلام دينـا وبمحمـد رسـولا** ) رواه مسلم واتـە : منــيش بــەدڵ قەناعــەتى تــەواوم هەيــە و بــەزوبان دەڵـێم و بــە

کردەوەش دەیسەلمێنم [1] کە هیچ پەرستراو نین جگە لە خوا، وە موحەممەد نێرداوی خوایە ، من ڕازی بووم بەوەی کە بەس خوا پەروەردگارمە و ئیسلام ئاین و بەرنامەمە و موحەممەدیش نێرداوی خوایە و پێشەوامە .

بەرهەم و پاداشتی ئەم سوننەتە : ئەوەیە کە هەرکەس بیڵێت ئەوە خوای گەورەلە گوناحی پێشینی دەبورێت هەروەك لە صحیحی مسلم دا هاتووە .

٢. صەڵاوات دان لە سەر پێغەمبەر ( ﷺ ) لە کۆتایی بانگەکەدا، وەباشتر وایە کە صەڵاواتی ئیبراهیمی بڵێت [2] چونکە ئەوە صەلاواتی تەواوە . پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( **اذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل مايقول ، ثم صلوا على ، فانه من صلى على صلاة صلى الله عليه بها عشرا** ) رواه مسلم ـ واتە : هەرکاتێك گوێتان لە بانگ بوو ئێوەش وەك بانگ بێژ بڵێن پاشان صەڵاوات لەسەرم بدەن، چونکە بێگومان هەرکەسێك یەك صەڵاوات لە سەرم بدات ئەوە خوای گەورە دە صەڵاوات لە سەری دەدات .

---

[1] وشەی ( اشهد ) بەومانایە دێت کەباسمان کرد نەك بەمانای شایەتی.

[2] صەڵاواتی ئیبرامی ئەمەیە ( **اللهم صل على محمد وعلى ال محمد كما صليت على ابراهيم وعلى ال ابراهيم انك حميد مجيد ، وبارك على محمد وعلى ال محمد كما باركت على ابراهيم وعلى ال ابراهيم انك حميد مجيد** ) .

بەرهەم و پاداشتی ئەم سوننەتە : ئەوەیە كە خوای گەورە دەجار صەلاوات لە سەر ئەو بەندەیە دەدات نیارە صەلاواتی خوای گەورەش بۆ بەندەكەی باسكردن و ستایش كردنێتی لە لای مەلا ئیكەتە بەرێزەكان

٤. لە دوای صەلاوات دان سوننەتە بلێت (( **اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة ات محمدا الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاما محمودا الذي وعدته** )) **رواه البخاري.**

واتە : ( ئەی خوایە خاوەنی ئەم بانگەوازە تەواو ونوێژە بەرپاكراوە ، وەسیلەو پلەی بەرز بە موحەممەد ببەخشە ، وە ئەو پایەو مەقامە تێدا ستایش كراوەی كە بەڵێنت پێداوە پیّ ی بدە )

بەرهەم وپاداشتی ئەم سوننەتە ئەوەیە : كە تكاكردن و شەفاعەت كردنی پێغەمبەری ( ﷺ ) بۆ حەڵاڵ دەبێت لە رۆژی دوایدا .

٥. پاشان هەر دوعا و پاڕانەوەیەك كە بیەوێت بۆ خۆی بیكات ، چونكە هەرچی داوا بكات وەلامی دەدرێتەوە هەروەك پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ ) دەفەرموێت ( **قل كما يقولون يعني المؤذنين، فاذا انتهيت فسل تعطه** )) **رواه ابو داود و حسنه الحافظ ابن حجر و صححه ابن حبان** .. واتە : ( بانگ بێژ چی ووت تۆش وا بڵیّ ، وەكاتێك لیّ بۆیەوە داوا بكە پێت دەدرێت .

كۆی ئەم سوننەتانەش كە مسوڵمان جیّبەجیّ یان دەكات لە شەوو رۆژێكدا دەكاتە (٢٥ ) سوننەت

# سوننەتەکانی قامەت

ئەو چوار سوننەتەی یەکەمی بانگ سوننەتە لە کاتی قامەتیش دا بوترێت هەروەك لە فەتوای لیژنەی بەردەوامی لێکۆڵینەوەی زانستی و فەتوا دا هاتووە . کەواتە کۆی سوننەتەکانی قامەت دەکاتە (٢٠) سوننەت لە شەوو ڕۆژێکدا.

تێبینی /سوننەتە ئەوکەسەی کە گوێی لە قامەت دەبێت قامەت بێژچی دەڵێت ئەویش وەك ئەو بیڵێتەوە تەنها لە کاتی حی علی الصلاە ، حی علی الفلاح )) دا دەڵێت : لاحول و لاقوە الابالله . وە لە کاتی ( **قدقامت الصلاة** ) یش دا هەر دەڵێت (( **قد قامت الصلاة**)) و ناڵێت (( اقامها الله وادامها )) چونکە ئەو فەرموودەیە لاوازە .

## (( سوترەی بەردەمی نوێژ خوێن ))

پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرموێت (( **اذا صلى احدكم فليصل الى سترة وليدن منها ولايدع احد يمر بينه وبينها** )) **رواه ابو داود ابن خزيمة** . واتە : (( ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با سوترەیەکی لە پێش بێت و لێی نزیك بکەوێتەوە وەنە هێڵێ کەس لە نێوان ئەو و سوترە کەدا تێپەڕێت ))

ئەم فەرموودەیە گشتی یە لە سەر سوننەت بوونی سوترە لە کاتی نوێژدا چ لە مزگەوت یان لە ماڵ یان لە هەرشوێنێکی تر ، وە

پیاوان و ژنان تێیدا یەكسانن ، بەلاَم زۆرێك لە نوێژ خوێنان خۆیان لەم سوننەتە بێبەش دەكەن و نوێژ بێ سوترەدەكەن .

دیارە ئەم سوننەتە لە شەو ورۆژێكدا چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە لە گەڵ هەموو نوێژەفەرزو سوننەتەكان دا .بەلاَم لە نوێژی بە كۆمەڵ ( جماعە ) دا ئیمام سوترەی نوێژ خوێنانە .

# چەند وردەبابەتێك دەربارەی سوترە

١. سوترە بەهەمووشتێك پەیدا دەبێت كە نوێژ خوێن لە پـێش خـۆی دایـدەنێت چ دیـوار بێـت یـان كۆچـان یـان عـەموود یـان هەرشتێكی تر ، دیارە ئەندازەی پانی بۆ سوترە نی‌یە واتـە پـانی هەرچەندبێ دەبێت .

٢. بـەڵام درێـژی سـوترە دەبێـت ئەنـدازەی تەختـەداری دواوەی كورتان بێت واتە ئەندازەی بستێك بێت .

٣. ماوە و بەینی نێوان پـێ ی نوێـژ خـوێن وسـوترە ئەنـدازەی سێ باسك ( ذراع ) بێت بە شێوەیەك بتوانێت كڕنـووش ((سـجود )) بەئاسانی و فەراحی ببات ..

٤. سوترە سوننەتە بۆ ئیمام و بۆ هەموو كەسێك كـە بـۆ خـۆی نوێژ بكات .

٥. سوترەی ئیمام بـری سـوترەی نوێـژ خوێنـانیش دەكـەوێت هەروەها دروسـتە تێپـەڕبوون بـە نێـوان ئیمـام و نوێـژ خوێنـان دا ئەگەر پێویست بوو .

بەرهەم و پاداشتی جێ بەجێ كردنی ئەم سوننەتە :

١. بێگومان سوترە نوێژ دەپارێزێت لە بڕین و بەتاڵ كردنەوە .

٢. پاراستنی نوێژ خوێن لەم لاو لاکردن و بێ ئاگابوون چونکە خاوەنی سوترە تەنها تەماشای سوترەکە دەکات بۆیە بیروهۆشی تەنها لای نوێژەکەی دەبێت .

٣. ڕێ خۆش دەکات بۆ ئەوکەسەی کە بیەوێت ڕەت بێت لە بەردەم نوێژ خوێنەکەوە .

# نوێژە سوننەتەکانی شەو وڕۆژ

١. سوننەتە ڕاتبەکان / واتە ئەو سوننەتانەی کە لە گەڵ نوێژە فەرزەکان دەکرێت (( **مامن عبد مسلم يصلى لله تعالى كل يوم ثنتى عشرة ركعة تطوعا غير فريضة الابنى الله له بيتا فى الجنة او بنى له بيت فى الجنة** ) رواه مسلم

واتە ( هەربەندەیەکی مسوڵمان لە شەو و ڕۆژێك دا دوازدە (١٢) ڕکاتی سوننەت بێجگە لە فەرزەکان بکات ئەوە بێگومان خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات یان ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێت ) .

ئەو دوانزە ڕکاتە ئەمانەن : چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ ، دوو ڕکات لە دوای ، دوو ڕکات لە دوای نوێژی شێوان ، دوو ڕکات لە دوای نوێژی خەوتنان ، دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی .

کەواتە برای خۆشەویست ئایا حەز لە ماڵێك لە ماڵەکانی بەهەشت ناکەیت ؟ ! ! سور بە لەسەر پاراستن و بەردەوام بوون

و ئەنجام دانـی ئـەم ئامۆژگارییـە پێغەمبـەری یـە و ڕۆژانـە دوازدە ڕکاتی سوننەت بکە .

٢.نوێژی چێشتەنگاو : دیارە نوێژی چێشتەنگاو بەرامبەر (٣٦٠) خێرە ، چونکە لاشەی مرۆڤ لـە ٣٦٠ جومگـە پێك دێت وە هـەر جومگەیەك لەو جومگانـە پێویستی بـە خێرێك هەیە ڕۆژانـە بـۆ شوکرانە کردنی خوای گەورە بۆ ئەو نازو نیعمەتانـە ، جا کردنـی دوو ڕکـات نوێـژی چێشـتەنگاو بـری ئـەم ٣٦٠ خێـرە دەکـەوێت هەروەك پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێت (( **يصبح على كل سلامى مـن احـدكم صـدقة ، فكـل تسـبيحة صـدقة ، وامـر بالمعروف صدقة ، ونهى عن المنكر صدقة ، ويجـرى عـن ذلـك ركعتان من الضحى** ) رواه مسلم .

واتە : لەسەر هەر جومگەیەکی هەر کامێکتـان پێویسـتە لـە هـەر ڕۆژێکـدا چـاکە یـەك بکـات ، جـا هــەموو ( سـبحان الله) گوتنێـك چاکەیە، وەفەرمان بە چاکە چاکەیە ، وەڕێگری لە خراپە چاکەیە ، وە دوو ڕکات نوێژکە کاتی چێشتەنگاو بیانکات بری ئەمانـە هـەموو دەکەوێت .

هەروەك ئەبو هـورەیرە ـ ڕەزای خـوای لێ بێـت ـ دەفـەرموێت (( **اوصانى خليلى بثلاث : بصيام ثلاثة ايام فى كل شهر وركعتـى الضـحى وان اوتـر قبـل ان انـام** )) ـــ متفـق عليـه ـــ واتـە خۆشەویستەکەم ـ مەبەست پێغەمبەرە ( ﷺ ) ـ ئامۆژگـاریکردم

بەسێ شت : ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك ، وە كردنی دوو ركات نوێژی چێشتنگاو ، وە نوێژی وەتر بكەم پێش ئەوەی بخەوم .

---

كاتی نوێژی چێشتەنگاو /دەست پێ دەكات لە دوای هەڵهاتنی ڕۆژ و بەرز بوونەوەی بەئەندازەی ـ ڕمێك هەتاوەكو كاتی نوێژی نیوەڕۆ ، ئەندازەی چارەكە سەعاتێك پێش نوێژی نیوەڕۆ .

❖ ژمارەی ڕكاتەكانی : لایەنی كەم دوو ڕكاتە و لای زۆریش هەشت ڕكاتە ، هەندێ لە زاناكانیش دەڵێن لای زۆری نی یە .

٣. سوننەتی نوێژی عەسر : پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت (( **رحم الله امرءا صلى قبل العصر اربعا** ))

**رواه ابو داود و الترمذی** ـ واتە : ڕەحمەت و میهرەبانی خوا لە سەر ئەو كەسەی كە پێش نوێژی عەسر چوار ڕكاتی سوننەت بكات.

٤. سـوننەتی نوێـژی شـێوان (( المغـرب )) : پێغەمبـەری خۆشەویستمان (ﷺ ) دەفەرموێت (( **صلوا قبل المغرب قـال فی الثالثة لمن شاء** )) رواه البخاری واتـە : نوێژێكـەن پـێش نوێـژی شێوان ، لەجار سێیەم دا فەرمووی هەركەسێك وویستی لێ بوو .

٥. سـوننەتی نوێـژی خـەوتنان ( **العشـاء** ) پێغەمبـەر(ﷺ ) دەفەرموێت (( **بین كل اذانین صلاة ، بین اذانین صلاة ، بـین كل اذانین صلاة ( قـال فی الثالثة لمن شاء** )) ـ متفق علیه.

واتە : لە نێوان هەردوو بانگێکدا ـ واتە بانگ وقامەت ـ دوو ڕکات سـوننەت هەیـە ، لـە نێـوان هـەردوو بانگێکـدا دوو ڕکـات سـوننەت هەیە، لـە نێـوان هـەردوو بانگێکدا دوو ڕکـات سـوننەت هەیـە ( لـە جاری سێ یەم دا فەرمووی هەرکەسی ویستی لێبوو ))

سوننەتەکانی شەو نوێژ

پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرموێت ( **افضل الصيام بعد رمضان شهر الله الحرام ، وافضل الصلاة بعد الفريضة صلاة الليـل ))** رواه مسـلم ـ واتـە : باشـترین ڕۆژو دوای ڕۆژووی ڕەمـەزان ڕۆژووی مـانگی موحەڕەمـە ، وە چـاکترین نوێـژیش دوای فـەرزەکان شـەو نوێژە .

١. ژمارەی ڕکاتەکانی شەو نوێژ سیازدە یان یانزە ڕکاتە لە گـەڵ درێژکردنەوەی ڕکاتەکان بە تایبەتی درێژکردنەوەی وەستان ـ واتە قورئان زۆر بخوێنێ لە ڕکاتەکان ئەگەر قورئانی لە بـەربوو ـ ( **كـان** ( ﷺ ) **يصـلي احـدى عشـرة ركعـة كانـت تلـك صلاته ))** **رواه البخاري وفي رواية اخرى ( يصلي بالليل ثلاث عشـرة ركعـة )** **رواه البخاري.**

٢.سوننەت واتەکاتێك هەستا بۆ شـەو نوێـژ سـیواك بکـات و (١٠) ئایەتی کۆتایی سورەتی ( ال عمران ) بخوێنێت لە ئایەتی ( **ان فـي خلق السماوات والارض واختلاف الليل** ..........................) تاوەکو کۆتایی سورەتەکە .

٢. هەروەها ئەم نزاو پاڕانەوەیە بخوێنێت ( **اللهم لك الحمد انت قيم السماوات والارض ومن فيهن ولك الحمد انت نورالسماوات والارض ومن فيهن ، ولك الحمد انت ملك السماوات والارضومن فيهن ، ولك الحمد انت الحق ، ووعدك الحق ، ولقاؤك الحق ، وقولك حق ، والجنة حق ، والنارحق، والنبيون حق ، ومحمد حق ، والساعة حق ، اللهم لك اسلمت ، وبك امنت ، وعليك توكلت ، واليك انبت ، وبك خاصمت ، واليك حاكمت ، فاغفرلي ماقدمت وما اخرت ، وما اسررت وما اعلنت ، انت المقدم وانت الموخر لااله الاانت ( او لااله غيرك ) رواه البخاري ومسلم و اللفظ للبخاري .ـ**

واتە : ( ئەی خوایە هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ تۆ یە تۆ ڕاگری ئاسمانەكان و زەوی و ئەوانەشی تیایدان ، ئەی خوایە هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ تۆیە تۆ نوور و ڕووناكی ئاسمانەكان و زەویت و ئەوانەشی تیایدان ، ئەی خوایە هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ تۆیە تۆ پاشا و خاوەنی ئاسمانەكان و زەویت و ئەوانەشی تیایدان ، هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ تۆیە تۆ ڕاست و حەقیت وە بەڵێنت ڕاست و حەقە ، وە قسەو وتەت ڕاست و حەقە ، وەبەهەشت ڕاست و حەقە ، وە ئاگر ڕاست و حەقە ، وەپێغەمبەران ڕاست و حەقن ، وە موحەممەد ڕاست و حەقە ، وەڕۆژی دوای ڕاست وحەقە ، ئەی خوایە من تەنها ملم كەچ كرد بۆ تۆ ، وە باوەڕەم پێهێنایت ، وە پشتم تەنها بە تۆ

بەست ، وە تەنها بۆ لای تۆ گەڕامەوە ، وەبەیارمەتی تۆو لە پێناوی تۆدا ڕق و دوژمنایەتی دەکەم ، وە هەموو بڕیار و حوکمێکم بۆ لای تۆ گێڕایەوە و تۆ دەکەم بە حاکم ، دەئەی خوایە خۆشببە لەوانەی کە کردوومە و ئەوانەشی دەیکەم ، وە ئەوانەی بە ئاشکرا کردوومە ئەوانەی بە نهێنی ، تۆ یەکەم کەسیت و تۆ کۆتایی بێ تەواو بوونیت ، هیچ پەرستراونین تۆ نەبێت ( یان هیچ پەرستراو نین جگە لەتۆ)

٤. هەروەها سوننەتە دەست پێ کردنی شەو نوێژ بەدوو ڕکاتی کورت بۆ ئەوەی گورج و چالاك بێت بۆ ڕکاتەکانی تر ، پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرموێت( **اذا قام احدکم من اللیل فلیفتتح الصلاة برکعتین خفیفتین** ) رواه مسلم واتە :ئەگەر یەکێکتان هەستا بۆ شەو نوێژ با نوێژەکەی دەست پێ بکات بەدوو ڕکاتی کورت .

٥. هەروەها سوننەتە دوعای دەست پێ کردن (( استفتاح )) ی شەو نوێژ بخوێنێت ئەوەی کەوارد بووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ ) کە ئەمەیە ( **اللهم رب جبریل ومیکائیل واسرافیل ، فاطر السماوات والارض عالم الغیب والشهادة ، انت تحکم بین عبادك فیماکانوا فیه یختلفون اهدنی لما اختلف فیه من الحق باذنك انك تهدی من تشاء الی صراط مستقیم** )) رواه مسلم .

واتە : ئەی خوایە پەروەردگاری جوبرائیل و میکائیل واسرافیل ، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی زانای هەموو زانستە ئاشکراو پەنهانەکان ، بەڕاستی هەرتۆ بڕیار دەدەی لە نێوان بەندەکانت لەوشتانەی کە جیاوازن تێیدا، خوایە ڕێنومایم بکە لەوەی کە خیلاف و ڕاجیایی تێیدایە لە حەق بەریامەتی و کۆمەکی خۆت ، بێگومان تۆ ڕێنومایی هەرکەسێك وویستت بێ دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست .

٦- سوننەتە درێژە بدات بەپێوە وەستان لە شەو نوێژدا ، پرسیار لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ) کرا کام نوێژ زۆر چاکە ؟

فەرمووی ( **طول القنوت** ) رواه مسلم - واتە زۆر وەستان. مەبەست لە ووشەی ( القنوت )) واتە : ڕاوەستان ( القیام ).

٧. هەروەها سوننەت وایە پەنا بە خوای گەورە بگرێت لە کاتی خوێندنی یان بیستنی ئایەتی سزاو بڵێت ( **اعوذ بالله من عذاب الله** ) واتە : پەنائەگرم بەخوا لە سزای خوا. هەروەها داوای ڕەحمەت و بەخششی خوای گەورە بکات لەکاتی خوێندن یان بیستنی ئایەتی ڕەحمەت بەم ڕەنگە بڵێت ( **اللهم انی اسالك من فضلك** ) واتە : ئەی خوایە من داوای فەزڵ و بەخششت دەکەم . هەروەها ( سبحان الله ) بکات لە کاتی خوێندن یان بیستنی ئەو ئایەتانەی باسی پاکی و بێگەردی خوای گەورە دەکەن . هەروەك لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە ( .......... **یقرا مترسلا ، اذا مربایة فیها تسبیح سبح ، واذا مر بسؤال**

سال ، واذا مر بتعوذ تعـوذ ... ) رواه مسـلم واتـە: پێغەمبـەری خوا (ﷺ) قورئانی بە هێمنـی و لـە سـەرخۆیی دەخوێنـد و كاتێك بگەیشتایە بە ئایەتی پاكو بێگەردی خوای گەورە ( سبحان الله )ی دەكرد و كاتێك بگەیشـتایە بـە ئایـەتی داواكـردن داوای دەكـرد ، كاتێك بگەیشتایە بە ئایەتی پەناگرتن پەنای دەگرت ..

❖ ئەوهۆكارانەی كە دەبنە یارمەتی دەر بۆ هەستان بۆ شەو نوێژ :

١. نزاو پاڕانەوە

٢. زوو خـەوتن و دووركەوتنـەوە لـە دانیشـتنی شـەو و درەنـگ خەوتن .

٣. قەیلولە كردن ( خەوتنی پێش نوێژی نیوەڕۆ بە ساعتێك ) یان پاش نیوەڕۆ ئەگەر نەكرا

٤. وازهێنان لە گوناح و تاوان .

٥. جیهاد كردنی نەفس و ململانی كردنیبەردەوامی .

## نوێژی وەتریش چەند سوننەتێكی هەن

١. سوننەتە ئەوكەسەی كـە سـێ ڕكـات وەتـر دەكـات لـە ڕكـاتی یەكەم دا لەدوای خوێندنی فاتیحە سورەتی ( الاعلی ))((سبح اسـم ربك الاعلی ) بخوێنێت ، وەلە ڕكاتی دووەم دا سورەتی ( الكافرون)

(( قل يا ايها الكافرون ) بخوێنێت و لە ڕكاتی سێ یەم دا سـورەتی ئـیخلاص ( قـل هـوالله احـد ) بخوێنێـت هـەروەك لـە فـەرموودەی ئیمامی **ئە بوداود و ترمذی وابن ماجە** دا هاتووە .

٢. كاتێـك سـەلامی دایـەوە سـێ جـار بڵێـت (( سـبحان الملـك القدوس)) واتە : پاكی و بێگەردی بۆ پادشای پـیرۆز . لەڕیوایـەتی ئیمامی ( **الدارقطینی** )دا دەفەرموێت لە جاری سێیەم دەنـگ بەرزدەكاتەوە و دەڵێت (( **رب للملائكة والروح** ) واتە پەروەردگاری مەلائیكەتەكان و ڕوحە واتە ـ جبرائیـل ـ ئـەم فەرموودەیەش شێخ **لە رناووط** دەڵێت صەحیحە .

---

❖ دووڕكـاتی سـوننەتی پـێش نوێـژی بـەیانیش چـەند سوننەتێكی تایبەتی هەن :

١. پەلــە كــردن تیێــدا و درێــژ نەكردنــەوەی ـ بەمــەرجێك روكنەكانی بەتـەوای جێبەجی بكـات ـ دایكمـان عائیشـە ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ دەڵێت ( **كـان رسـول الله ( ﷺ ) يصـلى ركعـتين خفيفتين بين الاذان والاقامة من صلاة الصبح ) متفق عليـه** واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو ڕكات نوێژی سووكی ، واتە پەلەی ـ دەكرد لە نێوان بانگ و قامەتی نوێژی بەیانی .

٢. سوننەتە لەم دووڕكاتەدا ئایەتی (١٣٦ ) ی سورەتی بەقـەرە ( **قولوا امنـا بـا الله ومـا انـزل الينـا** ...) بخوێنێـت لـە ڕكـاتی

یەکەم دا وە لە ڕکاتی دووەمیش دا ئایەتی (٥٢) ی سورەتی ئالی عیمران ( فلما احس عیسی منهم الکفر ..)

یان ئایەتی (٦٤) ی هەمان سورەت ( **قل یا اهل الکتاب تعالوا الی کلمة سواء** ...... ) بخوێنێت لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت لە ڕکاتی یەکەم دا سورەتی ( الکافرون ) و لە ڕکاتی دووەم دا سورەتی ( الاخلاص ) بخوێنێت .

هەردوو ریوایەتەکە ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە .

٣. ڕاکشان بە لای ڕاست دا دوای تەوابوونی ئەم دووڕکاتە ( کان النبی (ﷺ ) **اذا صلی رکعتی الفجر اضطجع علی شقه الایمن** )) رواه البخاری ـ واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ ) کاتێك دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد بەلای ڕاستیدا ڕادەکشا .

جا کاتێك ئەم دوو ڕکاتە لە ماڵەوە دەکەیت هەوڵدە بەلای ڕاستدا ڕابکشێ ئەگەر ماوەیەکی زۆر کەمیش بێت بۆ ئەوەی ئەو سوننەتە لە دەست نەچێت.

## ❖دانیشتن و مانەوە لە دوای نوێژی بەیانی

**ان النبی ( ﷺ ) کان اذا صلی الفجر جلس فی مصلاه حتی تطلع الشمس حسنا ) رواه مسلم** ـ واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك کە نوێژی بەیانی دەکرد لە شوێنی خۆی دادەنیشت تارەکو ڕۆژیە جوانی و تەواوی دەردەکەوت .

ـ ئيمـامى نـەوەوى دەفـەرموێت ( واتـاى ووشـەى ( حسـنا ) لـە فەرموودەكەدا **اى طلوعـا حسـنا اى مرتفعـة** ـ بەرزبوونـەوە و دەركەوتنى پێێ .

---

❖ نيعمەتێكى زۆر گەورەيە : بێگومـان خـواى گـەورە چـەند مـەلائيكـەتێكى تايبـەت كـردووە بـە داواى نـزاو پاڕانـەوە بـۆ ئەوكەسانەى كە لە مزگەوتەكان دمێننەوە و دادەنيشن لە پـاش يـان لـە پـێش نوێژەكانـەوە يـادى خـواى گـەورە دەكـەن ، ئـەم مەلائيكەتانە دوعاى خێريان بۆ دەكەن و بەردەوام دەڵێن : اللهم اغفرله ، اللهم ارحمه واتە ئەى خوايە گيان لێيان خۆشبە خوايـە گيان ڕەحميان پىێ بكە . هەروەك لە فەرموودە دا هاتووە

❖ كەوا بوو براى مسوڵمان تەماشاكە و بڕوانە چەند ڕێـزت زۆرە لاى خـواى گـەورە كاتێـك گوێڕايـەڵى بكـەيت وبيپـەرستى ئـەوە بێگومـانم خـواى گـەورە مەلائيكـەتـە بـەڕێزەكانى تايبـەت دەكات بەنزاو پاڕانەوە بۆت .

---

## سوننەتە گوفتاريكانى نوێژ

### (( سنن الصلاةالقولية ))

١. خوێندنى نزاى دەست پىێ كردن (( الاستفتاح )) دواى ووتنـى ( الله اكبر ))ى يەكـەمى دا بەسـتنى نوێـژ ، سـوننەتە ئـەم دوعايـە بخوێنێت ( سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك ، وتعالى جدك ولااله

غيرك )) رواه **الاربعة** ـ واتە : ئەى خوايە پاك و بێگەردت دەگرم ، وە ناوت بەرزو پرپيت و پيرۆزە وە پايەت زۆر گەورە و بەرێزە ، جگە لە تۆ هيچ پەرستراونين .

يان ئەم نزايە بخوێنێت ( **اللهم باعد بينى و بين خطا ياى كما باعدت بين المشرق والمغرب ، اللهم نقنى من خطاياى كما ينقى الثوب الابيض من الدنس ، اللهم اغسلنى من خطاياى بالثلج و الماء والبرد** ) **ـ رواه البخارى و مسلم ـ**

واتە :ئەى خوايە گيان من و هەڵە و تاوانەكانم لە يەك دور ريخەوە وەك چۆن ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات لە يەك دوور خستووەتەوە ، ئەى خوايە گيان لە گوناحەكانم پاكم بكەوە وەك چۆن پۆشاكى سپى لە چڵك خاوێن دەكرێتەوە ، ئەى خوايە گيان خراپە و تاوانەكانم بە ئاوو بەفرو تەرزەى ڕەحمەتت بشۆ

يان هەر دوعاو نزايەكى تر كە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ ) هاتبێت .

٢. پەناگرتن بە خوا پێش خوێندنى قورئان (( فاتيحە ) بەم ڕەنگە بڵێت ( **اعوذ بالله من الشيطان الرجيم** ))

واتە : پەنا بەخوا دەگرم لە شەيتانى نەفرين لێكراو .

٣. ناوى خوا مێنان ( البسمله ) (( **بسم الله الرحمن الرحيم** )) .

٤. ووتنى امين دواى تەواو بوونى سورەتى فاتيحە . ووشەى امين واتە : خوايە گيان ولاممان بدەرەوە .

٥. خوێندنی سورەتێك یان ئایەتێك یان چەند ئایەتێك لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە لە دوو ڕكاتی نوێژی بەیانی و نوێژی هەینی ((الجمعە )) و هەروەها ڕكاتی یەكەم و دووەمی نوێژی نیوەڕۆ و عەسرو شێوان و خەوتنان . هەروەها .

ـ هەموو نوێژە سوننەتەكان . بەلآم ئەگەر لە گەلّ ئیمام دا نوێژی كرد نوێژی نیوەڕۆ و عەسربوو ئەوە دیسان بۆی هەیە و سوننەتەكە لە دوای خوێندنی فاتیحە سورەتێكی تر یان چەند ئایەتێكی تر بخوێنێت . بەلآم ئەگەر نوێژی بەیانی و شێوان و خەوتنان بوو ئەوە تەنها خوێندنی سورەتی فاتیحە سوننەتە یان فەرزە .

٦. ووتنی ئەم نزایە ( **مل السماوات ومل الارض ومابینهما وملَ ماشئت من شی بعد اهل الثناء والمجد ، احق ماقال العبد ، وكلنا لك عبد ، اللهم لامانع لما اعطیت ولامعطی لما منعت ولاینفع ذا الجد منك الجد** ) رواه مسلم . واتە:

( ئەی خوای گەورە سوپاس و ستایش بۆ تۆیە پڕی ئاسمانەكان و زەوی و پڕی هەر شتێكی دیكە كە حەزبكەی ، ئەیخاوەنی مەدح و سەناو پایەی بەرز ، شایستەترین قسە كە بەندە گوتوویەتی و هەموو شمان بەندەی تۆین ئەی خوایە هیچ ڕێگریك لە بەردەم بەخشینت دا نیەو هیچ كە سێكیش ناتوانێ شتێك ببەخشێ كە تۆ ناتەوێ ، وە ماڵ و سامان و دەوڵەمەندی هیچ خاوەن ماڵ و دەوڵەمەندێك لە بەرانبەر دەسەلآتی تۆدا دادی

نادات و فریای ناکەوێت ) ، لە دوای هەستانەوە لەرکوع و لەدوای ووتنی ( **سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد حمدا كثيرا طيبا مباركافيه** )) .

٧. زیاتر لە یەکجار خوێندنی زیکرەکانی رکوع و سجود.

٨. ووتنی ( رب اغفرلى رب اغفرلى ) لە نێوان هەردوو سوجدەکاندا

٩. دوعاو پاڕانەوە لە دوای خوێندنی (( تحيات )) بەم ڕەنگە بڵێت (( **اللهم انى اعوذ بك من عذاب جهنم ومن عذاب القبر ومن فتنة المحياوالممات ومن فتنة المسيح الدجال** )) رواه البخاري و مسلم .

واتە : ئەی خوایە پەنادەگرم بەتۆ لەسزای دۆزەخ و ئازارو ئەشکەنجەی گۆڕ و لە بەڵای ژیان و مردن و لە خراپەی بەڵای مەسیحی دەجاڵ .

❖ سوننەت وایە کە نوێژ خوێن لە کاتی کڕنووش ( سجود ) دا تەنها ( سبحان ربى الاعلى ) نەخوێنێت بەڵکو چاکتروایە دوعا و پاڕانەوە زۆر بکات چونکە لە کاتی کڕنووش دا بەندە زۆر نزیکە لە خوای گەورەوە هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( **اقرب مايكون العبد من ربه هو ساجد فاكثروا فيه من الدعاء** ) رواه مسلم واتە : بەندە لە کاتی کڕنووش بردن دا لە هەموو کات و حاڵێك لە خوای پەروەردگارەوە نزیکترە جازۆر تێیدا بپاڕێنەوە .

دیارە نزاو پاڕانەوەی زۆر هاتوون لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە كاتی كڕنووش دا هەركەسێك ئارەزووی شارەزابوونی هەیە بانەماشای كتێبی ( حصن المسلم ) ی شێخ قه حطانی بكات كە كراوە بە كوردی بەناوی ( قەڵای مرسوڵمان ))

❖ هەموو سوننەتە گوفتاری یەكان لە هەموو ڕكاتێكدا دووبارە دەبێتەوە جگە لە نزای دەست پێ كردن (الاستفتاح ) نەبێت تەنها لە ڕكاتی یەكەم دا دەوترێت ، هەروەها نزای دوای تەحیاتی كۆتایی .

كەواتە كۆی سوننەتە گوفتاری یەكان لەنوێژە فەرزەكان دا دەكاتە (١٣٦ ) سوننەت .

ـ ئەگەر بلێین لە هەر ڕكاتێكدا هەشت سوننەت دووبارە دەبێتەوە . وە لە نوێژە سوننەتەكان دا كە (٢٥ ) ڕكاتن ـ بەشەو نوێژ و دووڕكاتی نوێژ چێشتەنگاوەوە لەشەو و ڕۆژێكدا دەكاتە (١٧٥ ) سوننەت ، وە جاری وامەیە زیاتر دەكات ئەگەر ژمارەی ڕكاتەكان زیاتر بكات .

بەڵام ئەو سوننەتە گوفتاریانەی كە دووبارە نابنەوە ـ كەدوانن ـ كۆی ئەوانیش دەكاتە (١٠) سوننەت لە فەرزەكاندا، وە لەنوێژە سوننەتەكاندا دەكاتە ( ٢٤ ) ـ جگە لە شەو نوێژ وچێشتەنگاو و سلاوی مزگەوت ـ سوننەت . وە جاری واش هەیە زیاتر دەكات بەپێ ی زیاتر كردنی نوێژەكان .

# سوننەتە كردارییەكانی نوێژ .

١. بەرزكردنەوەی هەردوو دەست لە كاتی ( الله اكبر ) ی دابەستن دا ( تكبيرة الاحرام ))

٢.بەرزكردنەوەی هەردوو دەست لەكاتی چوون بۆ ڕكوع.

٣. بەرزكردنەوەی هەردوو دەست لە كاتی بەرزبوونەوە لە ڕكوع.

٤. هەروەها لە كاتی هەستان بۆ ڕكاتی سێ یەم ئەگەر نوێژەكە دوو تەحیاتی تێیدا بوو

٥. نووساندنی پەنجەكان بەیەكەوە لە كاتی بەرزكردنەوەی دە ستدا .

٦. ناو لەپی دەستی ڕووبكاتە ڕووگە ( قبلە ) وە پەنجەكانی درێژكاتەوە و نەیان نوشتێنێتەوە

٧. دەستەكانی بەرزكاتەوە بۆ ئاستی شانی یان نەرمایی گوێی.

٨. دانانی دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپ یان گرتنی مەچەكی دەستی چەپ بەدەستی ڕاستی لە كاتی خوێندنی فاتیحەدا

٩. ڕوانین بۆ شوێنی كڕنووش بردن .

١٠. لێك جیاكردنەوەی هەردووپێ و بەبێ خستنیان لە كاتی وەستان دا ئەندازەی بستێك نەوەك زۆر بڵاویان بكاتەوە .

١١. بـەهێمنى و لەسـەرخۆ خوێنـدنى ئايـەت و ذيكـرەكـان و بیركردنەوە لە ماناكانیان .

## ❖ سوننەتەكانى ڕكووع

١. گرتنى ئەژنۆكان بەدەست وبلأوكرنەوەى پەنجان.

٢.ڕاستكردنەوەى پشتى لەكاتى ڕكووع دا بەڕێكى و تەواوى .

٣. جیاكردنەوە وبلأوكردنەوەى قۆڵەكانى لەم لاولاى خۆى .

### ❖ سوننەتەكانى كڕنووش بردن ( السجود )

١.جیاكردنەوە و بلاكردنەوەى قۆڵەكان لەم لاولاى خۆى.

٢. جیاكردنەوەى سكى لە ڕانەكانى .

٣. جیاكردنەوەى لاقەكانى( قاچەكانى ) لە ڕانەكانى .

٤. جیاكردنەوەى ئەژنۆكانى لە یەكتر لە كاتى كڕنووش دا

٥. ڕێك ڕاگرتنى پێیەكانى .

٦. دانانى هەردوو لەپى دەستى لە سەر زەوى و لكاندنى پێوە .

٧. قایم كردنى پێیەكانى بەزەوى یەوە و نەجوولأندنى.

٨. دانانى دەستەكان لە ئاستى شاك یان گوێ

٩. كردنەوەى دەست بەڕێكى و نەنوقاندنى .

١٠. بلأونەكردنەوەى پەنجەكان و نوساندنیان بەیەكەوە .

١١. دانانى دەستەكان بەئاست وڕێكى ڕووگە ( قبلە)

❖ چەند سوننەتێک لە نێوان هەردوو کڕنووش دا ( سنن بين السجدتين ).

دوو جۆر دانیشتن هەیە لە نێوان کڕنووشەکان دا

أ- جۆری یەکەم پێ ی دەوترێت ( **الاقعاء**) ئەویش ئەوەیە کە هەردووپێیەکان بەرزکاتەوەو لەسەر پاژنەکانی پێی دانیشێت

ب- الافتراش : ئەوەیە پێی ڕاستی بەرزیکاتەوە و پێ ی چەپی ڕابخاو لەسەری دانیشێت .

پێغەمبەری خوا (ﷺ ) ئەم دانیشتنەی وا درێژ دەکردەوە زۆر جار وا دەزانرا کە لەیادی چووە .

❖ دانیشتنی پشوودان ( **جلسة الاستراحة** )) ئەمیش بریتی یە لە دانیشتنێکی کەم لە دوای کڕنووشی دووەم لە ڕکاتی یەکەم و سێ یەم دا کاتی هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم و چوارەم وە هیچ نزاو پاڕانەوەیەکی تێدا نی یە.

## سوننەتەکانی تەحیاتی دووەم .

سێجۆر دانیشتن هەیە لەتەحیاتی دووەم یان کۆتایی :

أ . پێ ی ڕاستی بەرزکاتەوە و لە زەوی بچەقێنێت وە پێ ی چەپیشی لە ژێر لاقی ڕاستیەوەدەر بکات و لەسەر سمتی چەپی دانیشێت .

ب . وەك يەكـەم وايـە تـەنها ئەوەنـدە جيـاوازى هەيـە كـە لـەم جۆرەيـان دا پـێ ى ڕاسـتى بەرزناكاتـەوە بـەڵكو دايـدەنێت بـەو ئاستەى كە پێ ى چەپى پێو تێكردووە .

ج . پێ ى ڕاستى وەك جۆرى يەكەم دادەنێت و پـێ ى چەپيشـى دەخاتە نێوان ڕان و لاقى ڕاستيەوە

١. دانانى هـەردوو دەسـتى لەسـەر ڕانـەكانى : دەسـتى ڕاسـتى لەسەرانى ڕاستى و دەستى چەپيش لەسەرانى چەپى و پەنجەكانى بنوسێنێت بەيەكەوە و بەبينيان نەخات و ڕايان خات .

٢. ئامـاژەكردن بـە پەنجـەى شـايەتمانى لـە كـاتى تـەحيات دا لەسـەرەتاوە تـارەكو كۆتـايى ، هـەموو پەنجـەكانى پێكـەوە بنووسـێنێت و پەنجـە گەورەكـەى لەسـەر جومگـەى پەنجـەى ناوەڕاسـتى دابنـێ و تەماشـاى پەنجـەى شـايەتمانى بكـات كـە ئامازەى پێكردووە .

٣. ئاوڕدانەوە بەلاى ڕاست و چەپ دا لە كاتى سەلام دانەوە .

كەوا بوو سوننەتە كردارييەكان (٢٥ ) دانەن و لە هەموو ڕكاتێكدا دووبـارە دەبنـەوە ، كەواتـە كـۆى ئـەو (٢٥) سـوننەتانە لـە نوێـژە فەرزەكان دا دەكاتە (٤٢٥ ) سوننەت، وەلە نوێژە سوننەتەكان دا دەكاتـە (٦٢٥ ) سـوننەت لـە شـەوو ڕۆژێكـدا . وە دەكاتـە زيـاتر ئەگەر ڕكاتەكان زياتر بن .

هەروەها هەندێ لەو سوننەتانەى كـە باسـمان كـرد يـەكجار يـان دووجار هەن لە هەرلەرزێكدا كە ئەمانەن :

١. دەست بەرزکردنەوە لە کاتی ( الله اکبر )) دا بەستن ( الاحرام ) دا .

٢. دەست بەرزکردنەوە لەکاتی هەستان بۆ ڕکاتی سێ یەم لەو نوێژانەی کە دوو تەحیاتن .

٣. ئاماژە ( **اشارة** ) کردن بە پەنجەی شایەتمان لە کاتی تەحیات دا .

٤. ئاوڕدانەوە بەلای ڕاست و چەپ لە سەلامدانەوەدا .

٥.دانیشتنی پشوودان ( **جلسة الاستراحة** ) کە دووجارە لە نوێژە چوار ڕکاتیەکاندا و یەك جارە لە نوێژەکانی تردا

٦. ( التورك ) بریتی یە لەوەی کەپێ ی ڕاستی بەرزیکاتەوە و نووکی پەنجەکانی بچەقێنێت بەزەوی یەوە و قاچی چەپی بخاتە ژێر لاقی ڕاستیەوە و لەسەرسمتی دانیشێت لە سەر زەوی . ئەمەش لە تەحیاتی دووەم دا دەکات لەو نوێژانەی کە دوو تەحیاتی تێیدایە.

کۆی ئەم سوننەتانەش (٣٤ ) سوننەت دەکات لە نوێژە فەرزەکان دا و (٤٨ )یش لە نوێژە سوننەتەکان دا لە شەوو ڕۆژێکدا.

کەوابوو برای مسوڵمان هەوڵبدە نوێژەکەت جوان بکەو بیرازێنەوە بەم سوننەتەکرداری و گوفتاریانە تاوەکو پاداشتی زۆر وەرگری لای خوای گەورە و پلەو پایەت بەرزبێت .

* ڕوونکردنەوەیەك : ئیمامی ئیبن ولقەیم دەڵێت: بەندە دوو ڕاوەستانی هەیە لەبەر دەستی خوای گەورەدا، ڕاوەستانێك لە نوێژدا و ڕاوەستانێکیش لە رۆژی دوای دا ، جا هەرکەس ڕاوەستانی یەکەمی تەواو و ڕێك پێك بێت ئەوە ڕاوەستانی رۆژی دوایشی بۆ ئاسان دەبێت ، بەڵام ئەگەر کەسێك ڕاوەستانی ئەم دونیای ناتەواو و کەم و کوڕ بێت یان هەرنەیکات ئەوە بێگومان وەستانی دوا رۆژی قورس و گران دەبێت .

## سوننەتەکانی دوای نوێژە فەرزەکان

۱. سێ جار ووتنی ( استغفرالله )) ویەك جاریش ( **اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت ياذا الجلال والاكرام** ) ـ رواه مسلم ـ واتە: ئەی خوایە تۆ سەلامیت و سەلامیش لای تۆیە ، مبارەك و پیرۆزیت ئەی پایە بەرزو بەدەسەڵات و خاوەنی رێز .

۲۱. ( **لااله الا الله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شى قدير ، اللهم لامانع لما اعطيت ولا معطى لما منعت ولاينفع ذا الجد منك الجد** ) رواه البخارى ومسلم ـ یەك جار واتە : ( هیچ پەرستراوێن جگە لە خوای گەورە، تاك و تەنیایە هیچ هاوبەش و هاوەڵی نیە ، هەرچی موڵك و سوپاس و ستایشە هەر بۆ ئەوە بەسەر هەموو شتێکدا توانا دارە ، ئەی خوایە هیچ ڕێگرو بەربەستێك نیە بۆ ئەوەی کە ئەیبەخشیت وە

هیچ بەخشەرێکش نی‌یە بۆ ئەوەی دەیگرێتەوە ، وە پایە بەرزی و دەوڵەمەندی هیچ سوودێکی نی‌یە بۆ خاوەنەکەی لە پایەبەرزی و دەڵەومەندی تۆ )

٣. ( **لااله الاالله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شي قدير ، لاحول ولاقوة الابالله ، لااله الاالله ولانعبد الااياه له النعمة وله الفضل وله الثناء الحسن ، ولااله الاالله مخلصين له الدين ولوكره الكافرين** ) رواه مسلم

واته ( هیچ پەرستراو نین جگە لە خوا ، تاك و تەنیایە و هیچ هاوبەش و هاوەڵی نی‌یە ، هەرچی موڵك و سوپاس و ستایشە هەربۆ ئەو و بەسەرهەموو شتێکدا تواناداره ، هیچ لادان و گوڕان و هێزێك نی‌یە مەگەر بەخوا نەبێت ، هیچ پەرستراونین جگە لە خوا ، وە جگە لەو هیچ ناپەرستین ، هەرچی نازو نیعمەت و چاکە هەیە بۆ ئەوە وستایشی جوان و چاکیش بۆ خۆیەتی ، هیچ پەرسترلونین جگە لە خوا نییەت پاك و دڵسوزین بۆ ئەو وەل کەچی و دینداریش هەر بۆ ئەوە گەرچی بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێت .

٤. سی وسیّ جار ( سبحان الله ) و ( الحمد الله ) ، جارێکیش ( **لااله الاالله وحد لاشريك له ، له الملك و له الحمد وهو على كل شي قدير** ) رواه مسلم

٥. ( **اللهم اعني على ذ كرك وشكرك و حسن عباد تك** ) رواه ابوداود و النسائي یەك جار واتە: ئەی خوایە یارمەتیم بدە لەسەر زیکرو یادکردنت و شوکرانە کردنت و جوان عیبادەت کردنت .

٦. ( **اللهم انی اعوذبك من الجبن ، واعوذبك ان اردالی ارذل العمر ، واعوذبك من فتنة الدنیا ،و اعوذبك من عذاب القبر** ) رواه البخاری - یەك جار .

واتە: ( ئەی خوایە من پەنات پێدەگرم لە ترسنۆكی ، وەپەنات پێدەگرم بەتۆ كە بكەومە تەمەنی بێ توانایی و پەككەوتویی ، وە پەنات پێدەگرم لە خراپەو فیتنەی دونیا ، وە پەنات پێدەگرم لە سزای گۆڕ )

٧. ( **رب قنی عذابك یوم تبعث عبادك** ) واتە (پەروەردگار لە سزای خۆت بمپارێزە لەو ڕۆژەدا كەبەندەكانت زیندوو دەكەیتەوە .بەرائی كوڕی مالیك دەفەرموێت : ( **كنا اذا صلینا خلف رسول الله** (ﷺ ) **احببنا ان نكون عن یمینه ، یقبل علینا بوجهه ، فسمعته یقول ( رب قنی عذابك یوم تبعث - تجمع - عبادك** ) رواه مسلم . واتە : ئێمە كاتێك لە پشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژمان دەكرد پێمان خۆش بوو لە لای ڕاستی پێغەمبەرەوە بین ، پاشان كە تەواو دەبوو ڕووی دەدایەوە و ڕووی تێدەكرین ، گوێم لێبوو دەیفەرموو - واتە : پێغەمبەر ﷺ ئەی پەروەردگار بمپارێزە لە سزای خۆت لەو ڕۆژەدا كە بەندەكانت زیندوو - كۆ - دەكەیتەوە .

٨. خوێندنی سورەتی ئیخلاص ( قل هو الله احد ) و سورەتی فەلەق ( **قل اعوذ برب الفلق** ) و سورەتی ناس ( **قل اعوذ برب الناس** ) یەكی یەكجار دوای هەموو فەرزەكان بەلأم دوای نوێژی

بەیانی و نوێژی شێوان سێ جار . هەروەك ئیمامی ئەبو داود و **ترمذی** و نەسائی گێراویانەتەوە .

٩. خوێندنی ئایەتی لكورسی یەكجار . ئیمامی نەسائی گێراویەتەوە .

١٠. ( **لاالـه الله وحـده لاشريك لـه ، لـه الملك ولـه الحمـد يحيى ويميت وهـو علـى كـل شـي قـدير** ) دەجار دوای نوێژی بەیانیان و شێوان . ئیمامی **ترمذی** گێراویەتەوە .

١١. كردنی ئەم و یردو زیكرانە بە پەنجەكان .

١٢. خوێندنی ئەم زیكرو دوعایانە لە شوێنی خۆی واتە ئەو شوێنەی كە فەرزەكەی لێكردووە .

* كۆی ئەم سوننەتانەش كە باسمان كرد لە دوای نوێژە فەرزەكان ئەگەر جێ بەجێ بكرێت دەكاتە (٥٥) سوننەت . وە لەنوێژی بەیانی و شێوان دا زیاتر دەكات .

بەرهەم و پاداشتی جێبەجێ كردنی ئەم سوننەتانە دوای هەموو فەرزێك و پارێزگاری لێكردنی :

أ . لەشەو رۆژێكدا (٥٠٠) خێرو چاكە بۆ مسولمان دەنوسرێت ئەگەر پارێزگاری لەم سوننەتانە بكات لە دوای هەموو نوێژە فەرزەكان ، چونكە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت ( **كل تسبيحة صدقة وكل تكبيرة صدقة ، وكل تحميدة صدقة ، وكل تهليلة صدقة** ) رواه مسلم ـ واتە ( هەموو ( سبحان الله )) و ((الله اكبر )) و (( الحمدالله ))و

((لاالەالا اللە ) یەك خێرو چاکە یەکی هەیە )).

ب / ئەگەر هەرمسوڵمانێك پارێزگاری لەم زیکر و ویردانە بکات ئەوە (٥٠٠ ) درەختی لە بەهەشت بۆ دەڕوێت لە هەر شەو و ڕۆژێکدا ، جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای ئەبو هورەیرە دا تێپەڕی لە کاتێکدا نەمامی دەناشت ، پێغەمبەریش فەرموو ( **یا اباهریرة الا ادلك علی غرس خیرلك من هذا** ؟ قال : **بلی یارسول الله ( قال : قل سبحان الله والحمد و لااله الاالله والله اکبر ، یغرس لك بکل واحدة شجرة فی الجنة** ) رواه ابن ماجه و صححه الالبانی ـ واتە ( ئایە لە ناشتنی ئەو نەمامە چاکترو باشترت پێ بڵێم ؟

ئەویش : ووتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی : بڵێ پاکی و بێگەردی بۆ خوا ، و سوپاس و ستایش بۆ خوا و هیچ پەرستراوێن تەنها خوای گەورەنەبێت ، خوا گەورە ترە ، ئەوە بەهەر یەکێك لە مانە درە ختێکت لە بەهەشت دا بۆ دەڕوێت .

ج. هەرکەسێك بەردەوام بێت لە خوێندنی ئایەتی‌لکورسی دوای هەموو نوێژێکی فەرز ، ئەوە هیچ شتێك نابێتە ڕێگری لە چوونە بە هەشتی دا .

د. هەرکەس پارێزگاری لەم سوننەتانە بکات و بەردەوام بێت لە سەریان ئەوە گوناح و تاوانەکانی دەوەرێت ئەگەر بە وێنەی کەفی دەریاش بێت . هەروەك لە صحیحی مسلم داهاتووە .

ﻫ . دەست خەڕۆ نەبوون و سەرشۆڕ نەبوون لە دونیا و دوا ڕۆژدا بۆ هەرکەسێك بەردەوام بێت لە سەرکردنی ئەم زیکرو دوعا یانە لە پاش هەموو نوێژێکی فەرز. پێغەمبەرمان (ﷺ ) دەفەرموێت ( **معقبات لايخيب قائلهن ....... وذكر هذه التسبيحات ...** ) رواه مسلم واتە : ( ئەو زیکرو ویردانەی دوای نوێژ فەرزەکان خاوەنەکەیان بێ هیواو دەستخەڕۆ نابێت .......)

و . پڕکردنەوەی ئەو کەم و کوڕیانەی کە لە نوێژەکەدا ڕووی داوە .

---

## چەند سوننەتێك کە لەبەیانیان و ئێواران دا دەوترێت
## (( **سنن يقال في الصباح والمساء** ))

١. خوێندنی ئایەتی‌لکورسی . پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ ) دەفەرموێت ( هەرکەسێك بەیانیان ئایەتە لکورسی بخوێنێت لە شەڕی جنۆکە دەپارێزرێت تاوەکو ئێوارە ، وە هەرکەسێك ئێوارە بیخوێنێت لە جنۆکە دەپارێزرێت تاوەکو بەیانی ) ـ ئیمامی نەسائی ڕیوایەتی کردووە و شێخ ئەلبانیش بە صحیحی داناوە .

٢. خوێندنی سورەتی ئیخلاص ( قل الله احد) و فەلەق ( **قل اعوذ برب الفلق** ) و ناس ( **قل اعوذ برب الناس** ) هەریەکی سێ‌جار .

بەرهەم و پاداشتی ئەم زیکرە ( هەرکەسێك بـەیانیان و ئێـواران سێ جارییان خوێنێت بێ نیازی دەکات لە هـەموو شـتێك ) ئیمـامی ئەبو داود **ترمذی** ریوایەتیان کردووە .

٢. ( **اصبحنا واصبح**[1] **الملك لله ، والحمدلله ، لااله الاالله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قـدير ، رب اسالك خير مافى هذا اليوم وخير مابعده**[2] **، واعوذ بـك من شر مافى هذا اليوم وشر مابعده ، رب اعوذ بـك مـن الكسـل وسوء الكبر ، رب اعـوذمن عـذاب النـار وعـذاب القـبر** ) واتـە(( بەیانیمان کردەوەو هەرچی موڵك هەیە هی خوایـە ، وە سـتایش بـۆ خوا ، جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین تاکەو هیچ هاوبەشی نی یـە ، هەرچی موڵك سـوپاس و ستایشـە هـەر بـۆ ئـەوە ، وە ئـەو بەسـەر هەموو شتێکدا توانا دارە ، ئەی پەروەردگارم داوای خێرو چـاکەی ئەم ڕۆژەو خێرو چـاکەی دوای ئـەم ڕۆژەشـت لێ دەکـەم وەپـەنات پێدەگرم لـە خراپـەو زیـانی ئـەم ڕۆژەو خراپـەو زیـانی دوای ئـەم ڕۆژە ، ئـەی پـەروەردگارم پـەنات پێـدەگرم لـە تەنبـەڵی و خـراپ پیربـوون ، ئـەی پـەروەردگارم پـەنات پێـدەگرم لـە سـزا و ئـازاری ئاگری دۆزەخ و سزای گۆڕ )) .

---

[1] بەڵام ئێواران دەڵێت ( امسينا ) لەجیاتی ( اصبحنا ).

(٢) دیارە ئێواران دەڵێت : **اسالك خير مافى هذه الليلة وخيرما بعدها** . لە جیاتی ( **اسالك خيرما فى اليوم وخير مابعدها** )

٤. ( **اللهم بك اصبحنا وبك امسينا ، وبك نحيا وبك نموت، واليك النشور** ) رواه **الترمذی**.

بەڵام لە ئێوارەدا دەڵێت ( **اللهم بك امسينا ، وبك اصبحنا ، وبك نحيا ، وبك نموت ، واليك المصير** ) .

واتە ئەی خوایە بەتۆ بەیانیمان كردوە و بەتۆ ئێوارەمان لێداهات و هەر بەتۆ دەژین و بەتۆش دەمرین و گەڕانەوەش هەر لای تۆیە ).

٥.( **اللهم انت ربی ، لااله الاانت ، خلقتنی ، وانا عبدك ، وانا علی عهدك ووعدك ما استطعت ، اعوذبك من شرما صنعت، ابوء لك بنعمتك علی ، وابوء بذنبی ، فاغفرلی ، فانه لايغفر الذنوب الاانت** ) رواه البخاری.

واتە ( ئەیخوایە تۆ پەروەردگاری منی ، جگە لەتۆ هیچ پەرستراونین ، دروستت كردووم ، وەمنیش بەندەی تۆم ، وەمن هەتا لەتوانام دایە هەرلەسەر پەیمان و بەڵێنی تۆم ، پەنات پێدەگرم لە خراپەی ئەوەی كە كردوومە ، دان بەچاكەی تۆدا دێنم لەسەرم ، وەدان بەگوناهەكانم دێنم ، جا لێم ببوورە ، بێگومان جگە لەتۆ هیچ كەس لە گوناح و تاوان نابووریّ

---

**بەرهەمی ئەم نزایە** / هەركەسێك ئێواران بە یەقینەوە بیخوێنێت و ئەو شەوە بمرێت ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە، هەروەها لە بەیانیاندا.

٦. (**اللهم انی اصبحت** [١] **اشهدك واشهد حملة عرشك وملائكتك وجميع خلقك انك انت الله لااله الاانت وحدك لاشريك لك وان محمدا عبدك ورسولك** ) - رواه ابوداود والنسائی - چوار جار .

واتە ( ئەی خوایە من بەیانیم کردەوە ، تۆ دەکەم بە شاهید هەروەها هەلگرانی عەرشت [٢] و هەمووهەلا ئیکەتەکانت و هەموو دروستکراوەکانت دەکەم بەشاهید کە بەس بۆ خوایت و هیچ پەرستراو نین بە حەق جگە لەتۆ تاك وتەنیای و هیچ هاوبەشت نی‌یە ، و بێگومان موحەممە دیش بەندە وپێغەمبەری تۆیە ) .

٧. (( **اللهم ماأصبح بی من نعمة او باحد من خلقك فمنك وحدك لاشريك لك فلك الحمد ولك الشكر** ) - رواه ابوداود و النسائی -

واتە ( ئەی‌خوایە هەرچی ناز و نیعمەتێك هەیە بەسەرمەوە لە لا بەن تۆوە یان لەلایەن یەکێك لە دروستکراوە کانتەوە ئەوە هەمووی لە تۆوەیە تاك و تەنیای و هیچ هاوبەشت نی‌یە و هەرچی سوپاس و ستاتیش و شوکرانە هەیە بۆ تۆیە ).

---

[١] ئێواران لەجیاتی ( اصبحت ) دەڵێت ( امسیت ).

[٢] مەبەست ئەو مەلائیکەتە بەڕێزانەیەکە عەرشی خوای گەورە هەڵدەگرن .

لەبەرهەمەکانی ئەم زیکرە ( هەرکەسێك بەیانیان بیخوێنێت ئەوە شوکرانەی ئەو ڕۆژەی بەجێ هێناوە ، وە هەرکەسێك ئێواران بیخوێنێت ئەوە شوکرانەی ئەو شەوەی بەجێ هێناوە ) هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە .

٨. ( **اللهم عافيني في بدني ، اللهم عافني في سمعي ، اللهم عافني في بصري ، لااله الاانت ، اللهم اني اعوذ بك من الكفر والفقر واعوذبك من عذاب القبرلااله الاانت** ) سێ جار . رواه ابوداود واحمد ـ واتە: ( ئەی خوایە ساغی و سەلامەتی بخەرە لاشەمەوە ، ئەی خوایە ساغی و سەلامەتی بخەرە گوێکانمەوە ، ئەی خوایە ساغی و سەلامەتی بخەرە چاوەکانمەوە ، هیچ پەرستراو نین جگە لە تۆ ، ئەی خوایە من پەنات پێدەگرم لە بێ باوەڕی و نەبوونی ، وەپەنات پێدەگرم لە سزای گۆڕ هیچ پەرستراونین جگە لەتۆ ).

٩. ( **حسبي الله لااله الاهو عليه توكلت وهو رب العرش العظيم** ) حەوت جار ـ اخرجه ابن السني مرفوعا وابوداود موقوفا. واتە ( خوام بەسەو هەر ئەویش پارێزەرو پشتیوانی منە هیچ پەرستراونین جگە لەو تەنها پشتم بەو بەستووەو ئەویش خاوەن و پەروەردگاری عەرشی مەزنە).

لەبەرهەمەکانی ئەم زیکرە :. ( هەرکەسێك بەیانیان و ئێواران حەوت جار بیخوێنێت ئەوە خوای گەورە بێ نیازی دەکات لە هەموو کارو بارێکی دونیا و دوا ڕۆژدا ) هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە.

١٠( **اللهم اني اسالك العفو والعافية في الدنيا والاخرة ، اللهم انى اسالك العفوو العافية في ديني و دنياي واهلي ومالي ،اللهم استرعوراتي ، وامن دووعاتي ، اللهم احفظني من بين يدي ومن خلفي وعن يميني وعن شمالي ومن فوقي، واعوذ بعظمتك ان اغتال من تحتي** ) رواه ابوداود ابن ماجه .

واتە( ئەي خوايە من داواي لێخۆشبوون و ساغي وسەلامەتيت لێدەكەم لە دونيا و دوا ڕۆژدا ، ئەی خوايە من داوای لێخۆشبوون و ساغي و سەلامەتيت لێدەكەم لە دين و ژين و خێزان و سامان و ماڵم دا ، ئەی خوايە عەيبم و كەم و كوڕييەكانم بپۆشە ، وە ترس وبيمم لابەو ئارامیم پێبەخشە ، ئەی خوايە بمپارێزە لە بەردەمم و پشتەوە وە لە ڕاست و چەپمەوە ، وە لەسەرومەوە ، وەپەنا دەگرم بەگەورەيت لەخشتە ببرێم وتيا بچم لە خوارمەوە).

١١ـ( **اللهم عالم الغيب والشهادة فاطر السماوات والارض ، رب كل شي ومليكه ، اشهدان لااله الاانت ، اعوذبك من شر نفسي ومن شر الشيطان وشركه ، وان اقترف على نفسي سوءا او اجره إلى مسلم** ) رواه **الترمذي** وابوداود . واتە ( ئەی خوايە زانای پەنهانی وئاشكرا ، بەديهێنەری ئاسمانەكان و زەوی ، ئەی پەروەردگار و خاوەن پادشای هەموو شتێك ، بەدڵ يەقينم هەيە و بە زوبان دیڵێم و بە كردەوەش دەيسەلمێنم كەجگە لەتۆ هيچ پەرستراونين ، پەنات پێدەگرم لە خراپەی نەفسم وە لە خراپەی

شەیتان و هاوبەش بڕیاردانی ، وە خراپەیەك بەسەرخۆم دا بهێنم یان تووشی مسوڵمانێکی کەم ).

١٢.( **بسم الله الذی لایضر مع اسمه شی فی الارض ولافی السماء وهو السمیع العلیم**) سێ جار . رواه ابوداود و **الترمذی** و ابن ماجه و احمد . واتە ( بەناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەو دا هیچ شتێك لە زەوی و ئاسمان زیان ناگەیەنێت ، وە ئەو بیسەرو زانایە ).

لەبەرهەمەکانی ئەم زیکرە ( هەرکەسێك بەیانیان و ئێواران سێ جار بیخوێنێت ئەوە هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێت ) هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە .

١٣.( **رضیت بالله ربا وبا لاسلام دینا و بمحمد ( ﷺ ) نبیا**) سێ جار . رواه ابو داود و**الترمذی** والنسائی واحمد .

واتە(رازی بووم کە بەس خوا پەروەردگارمە و ئیسلام دین و بەرنامەمەو موحەمەدیش (ﷺ ) پێغەمبەرمە ).

لەبەرهەمەکانی ئەم زیکرە / ( هەرکەسێك بەیانیان و ئێواران سێ جار بیخوێنێت ئەوە حەقە لە سەر خوای گەورە کە لە ڕۆژی قیامەت دا ڕازی بکات ) هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە .

١٤.( **یاحی یاقیوم برحمتك استغیث اصلح لی شانی کله ولاتکلنی الی نفسی طرفة عین** ) . رواه لحاکم وصححەوالله **الذهبی** . واتە ( ئەی زیندووی بەردەوام ، ئەی ڕاگری هەموو دروستکراوەکان ، داوای فریاکەوتنت لێدەکەم بە ڕەحمەتی خۆت،

هەموو کارو بارەکانم بۆ چاك و ئاسان بکە و مەمدەرە دەستی نەفسم ماوەی چاوپڕوو کاندنێکیش بێت ).

١٥- ( **اصبحنا على فطرة الاسلام وكلمة الاخلاص و دين نبينا محمد وملة ابينا ابراهيم حنيفا مسلما وما كان من المشركين** )

رواه احمد - واتە ( بەیانیمان کردەوە لەسەر فیترەتی ئیسلام وە لەسەر ووشەی دڵسۆزی و ئیخلاص - کەشەهادەتە - وەلەسەر دینی پێغەمبەرمان موحەممەد(ﷺ) ، وەلەسەر ڕێبازی باوکمان ئیبراهیم کە لەسەر حەق بووە و لە هەموو خراپەیەك لایداوە و مسوڵمان بووە ولە هاوبەش پەیدا کەران نەبووە ).

١٦.( سبحان الله وبحمده ) سەد جار . رواه مسلم - واتە ( پاکی وبێگەردی بۆ خوایە سوپاس و ستایش بۆ ئەوە ).

لەبەرهەمەکانی ئەم زیکرە ( هەرکەسێك بەیانیان و ئێواران سەد جا بیڵێت ئەوە هیچ کەسێك لە ڕۆژی دوایدا نایات بە چاکەیەك وەکو ئەو ،وەئەگەر یەکێك بیڵێت ئەوە گوناح و تاوانەکانی دەوەرێت ئەگەر بە وێنەی کەفی دەریاش بێت .

١٧.( **لااله الله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شي قدير** ) سەد جار- بەیانیان : رواه البخاری ومسلم

بەرهەمەکانی ئەم زیکرە : ( هەرکەسێك ١٠٠ جار بیخوێنێت لە ڕۆژێکدا ئەوە ئەم پاداشتانەی بۆ هەیە :.

١. بە وێنەی ئازاد کردنی دەبەندە وایە .

٢. سەد خێرو چاکەی بۆ دەنوسرێت

٣. سەد تاوان و گوناحی لێدەوەرێت .

٤ . لەشەیتان دەپارێزرێت ئەو ڕۆژە تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە)

هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە .

١٨ . ( استغفرالله واتوب اليه ) سەد جار لە ڕۆژێکدا . رواه البخاری ومسلم .

١٩.( **اللهم انی اسالك علما نافعا ورزقا طيبا وعملا متقبلا**) بەیانیان . رواه ابن ماجه

واتە ( ئەی خوایە من داوای زانیاری بەسوود و ڕزقی حەلاڵ و پاك و کردەوەی وەرگیراوت لێدەکەم ).

٢٠(**سبحان الله وبحمده ، عدد خلقه ورضا نفسه ، وزنة عرشه ومداد كلماته** ) سێ جار . رواه مسلم

واتە ( پاکی و بێگەردی بۆ خواو سوپاس و ستایشی ئەو ئەوەندەی ژمارەی دروستکراوەکانی و ڕەزا بوونی خۆی و ڕازاوەیی عەرشی و نفری ووشەکانی) .

٢١( **اعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق** ) سێ جار ئێواران . رواه الترمذی و ابن ماجه واحمد .

واتە : پەنادەگرم بەناو و ووشەو تەواوەکانی خوا لە شەڕ و خراپەی ئەوەی کە دروستی کردووە )

● بێگومان هەرکاتێك مسوڵمان زیکرێك لەم زیکرانە بخوێنێت ئەوە سوننەتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەری ﷺ) جێ بەجێ

کردووە . کەوا بوو پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك سووربێت لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەم زیکرو ویردانە بۆ ئەوەی خێرو پاداشتی زۆر و زیاتری دەست کەوێت و بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر بکات .

هەروەها پێویستە لە سەر هەموو مسوڵمانێك کە ئەم زیکرو ویردانە بە دڵسۆزی و ڕاستگۆی و بەقینەوە بخوێنێت و ئاگای لە ماناو واتاکانیان بێت بۆ ئەوەی کاریگەری تەواوی هەبێت لەسەر ژیان و ئاکارو هەڵسوکەوتی .

## چەند سوننەتێك لە کاتی گەیشتن بەخەڵکی

١. سەلام کردن / پرسیار لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا چ جۆرە ئیسلامەتیەك چاکترە ؟ فەرمووی :

**(تطعم الطعام ، وتقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف)**

- رواه البخاري ومسلم - واتە ( خواردن دەرخواردی خەڵکی هەژار و برسی بدەی ، وە سەلام بکەی لە خەڵکی چ بیانناسی چ نەیانناسی)

هەروەها جارێکیان پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و ووتی : السلام علیکم ، پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە و پاشان پیاوەکە دانیشت و پێغەمبەریش ووتی : دە - واتە دە خێری بۆ نوسرا -

پاشان پیاوێكی دیكە هات و ووتی : السلام علیكم ورحمة الله ، پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە و پاشان پیاوەكە دانیشت و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بیست ، پاشان پیاوێكی تر هات و ووتی : السلام علیكم ورحمة الله وبركاته ، پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە و پیاوەكەش دانیشت ، پێغەمبەریش فەرمووی : سی . ئیمامی ئەبو داود ڕیوایەتی كردووە .

جا برای خۆشەویستم بڕوانە و تێبفكرە بزانە چەند خێرو چاكەمان لە دەستی خۆمان داوە بە هۆی واز هێنان لە چەند ووشەیەكی ئاسان كە بە دڵنیاییەوە لە گەڵ كردنی یان وەڵام دانەوەی هەرسەلامێك دا ( ٣٠) خێرمان لە دەست دەچێت كە لایەنی كەم خێریش یەك بە دەیە كە دەكاتە (٣٠٠) خێر و زیاتریش لە هەرسەلامێك دا .

- كەواتە برای خۆشەویست زمانت ڕابێنە لەسەر تەواو كردنی سەلام تا (( وبركاته )) بۆ ئەوەی ئەو خێرو چاكە گەورەیەت دەست كەوێت .

- دیارە مسوڵمانیش ڕۆژانە چەند جارێك سەلام دووبارە دەكاتەوە لە شەو و ڕۆژێكدا لە چەند كات و شوێنێكدا بۆ نموونە لە كاتی چوونی بۆ مزگەوت سەلام لەنوێژ خوێنان دەكات ، هەروەها كاتێك لێیان جیادە بێتەوە ، وە لەكاتی چوونی بۆ ماڵەوە لە كاتی دەرچوونی ............... هتد .

- براكەم ئەوەش لەیاد نەكەیت كە سوننەت وایە بۆ ئەو كەسەی كە دەیەوێت بڕوات و شوێنێك بەجێ بهێڵێت سەلامی تەواو بكات چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( **اذا انتهى احدكم الى المجلس فليسلم فاذا اراد ان يفارق فليسلم فليست الاولى باحق من الاخرة** ) رواه ابوداود **الترمذى** . واتە : ( كاتێك یەكێك لە ئێوە دەچێتە ناو كۆڕ و دانیشتنێكەوە با سەلام بكات و كاتێكیش ویستی بەجێیان بێلێت با سەلام بكات چونكە سەلامی دوای لە سەلامی پێشەوە كە مترنی یە و هەردووكیان نزای خێرن .

- كۆی ئەو سەلامانەی كە تەنها لەكاتی چوونە مزگەوت و دەرچوون لێی و چوونە ماڵەوە و دەرچوون لێی لایەنی كەم دەكاتە (٢٠ ) جار لە شەوو ڕۆژێكدا ، بێگومان زیاتریش دەكات كاتێك كە دەچێت بۆ ئیش و پیشەكەی وە كاتێك لە ڕێگا و بان دەگات بە دۆست و ناسیاری یان لەكاتی تەلەفون كردن دا

.................

٢. ڕووخۆشی و كراوایی : پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرموێت ( **لا تحقرن من المعروف شيئاولو ان تلق اخاك بوجه طلق** )

رواه مسلم . واتە ( هیچ شتێك لە چاكە كردن بەكەم مەگرە ئەگەر هەر ئەوەندەش بێت كە كەبەڕووی كراوە و گەشەوە بگەیتە براكەت ).

٣. تەوقە كردن : پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموویت ( **مامن مسلمين يلتقيان فيتصافحان الاغفر لها قبل ان يفترقا** ) رواه ابو داود و **الترمذي** وابن ماجه - واتە ( هیچ كاتێك دوو مسولمان ناگەنە - یەكتر و پێكەوە تەوقە ناكەن مەگەر لێیان دەبوردرێ پێش ئەوەی لە یەكتر جیاببنەوە . ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت :

بزانە كە ئەم تەوقە كردنە سوننەتە لە هەموو بەیەككەیشتنێكدا.

- كەواتە برای بەڕێز هەوڵدە سور بە لەسەر تەوقە كردن لەگەڵ ئەو كەسەی سەلامی لێدەكەی و ڕووت كراوە و خۆش بێت كەوات كرد ئەوەبێگومان لە یەك كاتدا سێ سوننەت جێبەجێ كردووە .

٤. قسەی چاك و خۆش كردن : خوای گەورە دەفەرموێت ( **وقل لعبادي يقولوا التي هي احسن ان الشيطان ينزغ بينهم ان الشيطان كان للانسان عدوا مبينا** ) **الاسراء** - واتە : ( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە بەندەكانم بفەرموو چاكترین گوفتار بڵێن چونكە بێگومان شەیتان دەیەوێ نێوانیان تێكبدا - هەمیشە هانیان دەدات بۆ ووتنی گوفتاری هەڵە و خراپ - بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشكرای ئینسانە ).

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت (( **والكلمة الطيبة صدقة** )) رواه البخاري ومسلم -

واتە: قسەو ووتەی جوان و چاك خۆی لە خۆی دا خێرو چاكەیە

● دیارە قسەی جوان و چاك یادی خوای گەورە و نزاو پاڕانـەوە و سەلام كردن و سوپاس وستایش كردن و ئاكاری بەرز و جوان و كردەوەی چاك و پەسەند دەگرێتەوە .

● هەروەها قسەی چاك و جوان كار لە مرۆڤ دەكات بەوێنەی كار كردنی سیحرو جادو ، دڵ و دەرونی مرۆڤ ئاسوودە و بەختەوەر دەكات و بەردەوام هەست بە خۆشی و ئارامی دەكات .

● قسەی چاك و جوان بەڵگەیە لەسەر دڵ سافی و بێ كینـەیی بەندەی باوەڕدار .

● كەوابوو برای بەڕێز ئایە بیرت لەوە كردۆتەوە كە ژیانت هـەموو قسـەی چـاك و جـوان و خـۆش بێت هـەر لـە بـەیانی یـەوە كـە هەڵدەسیت تاوەكو ڕۆژ ئاوا دەبێت و پاشانیش تا كاتی خەوتنت .

گومانی تێدانی یە كە هاوسەر و منداڵ و كـەس و كـار و دۆسـت و دراوسـێ وهـەموو ئـەو كەسـانەی كەلـە گـەڵت دان هـەر هـەموو پێویستیان بەقسەی چاك و جوان و خۆش هەیە .

## سوننەتەكانی خواردن

● ئەو سوننەتانەی كە لە پێش و كاتی خواردندان :

١ ناوی خوا هێنان .

٢. خواردن بەدەستی ڕاست .

٣. لەبەردەستی خۆوە خواردن واتە دەستی بۆ ئەم لاو لا نەبات.

ئەم سێ سوننەتەش لەم فەرموودەیەدا كۆدەبنەوە ( **یاغلام سم الله ، وكل بیمینك ، وكل مما یلیك** ) رواه مسلم.

واتە: ( ئەی ڕۆڵەكە[1] ناوی خوا بێنە ، وە بەدەستی ڕاست بخۆ، وە لە بەردەستی خۆتەوە بخۆ ) .

٤. هەڵگرتنەوەی پارووی كاتێك كە دەكەوێت و خواردنی ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( **اذا سقطت من احدكم لقمة، فلیمط ماكان بها من اذی ثم یاكلها** ) رواه مسلم . ( ئەگەر لە كەسێكتان پاروویەك بەربووە باپاكی بكاتەوە و هەر پیسیەكی پێوە بوو لایبەرێت و پاشان بیخوات )

---

[1] مەبەست لەو ڕۆڵە یە عومەری كوری سەلەمەیە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) خۆی بەخێوی كردووە چونكەزڕ كوری پێغەمبەر بووە ، جا عومەر خۆی دەڵێت : من منداڵ بووم پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی بەخێوی دەكرم كاتێك كەنانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو قاپەكە دا بەئارەزووی خۆم، جا پێغەمبەر ئامۆژگاری كردم و فەرمووی ( یاغلام سم الله ....) ، عومەر دەڵێت : ئیتر لەو كاتەوە تا ئێستا هەر بەو شێوەیە نان دەخۆم كە پێغەمبەر (ﷺ ) فێری كردم ! !

٥. خواردن بەسێ پەنجە ، ( **کان رسول الله** ( ﷺ ) **یاکل بثلاث اصابع** ) رواه مسلم .

واتە : ( پێغەمبەری خوا (ﷺ ) بەسێ پەنجە نانی دەخوارد ) دیارە زۆرتر وای کردووە و ئەویش چاکترە واتە - خواردن بەسێپەنجە - مەگەر بۆ پێویستی نەبێت .

*شێوازی دانیشتن لەکاتی خواردن دا : وا سوننەتە کە قاچی راستی بەرزبکاتەوە و لەسەر پێ ی چەپی دانیشێت. یان لەسەر ئەژنۆ و سنگی پێیەکانی دانیشێت . هەروەك شێخی ئیبن و حەجەر لەکتێبی (( فتح الباری ) دا گوتوویەتی .

* سوننەتەکانی پاش خواردن :

١. لستنەوەی پەنجەکانی و دەورێکە ، دیارە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) فەرمانی دەکرد بەلستنەوەی پەنجەکان و دەوری و دەیفەرموو ( **انکم لاتدرون فی ایها برکة** ) رواه مسلم - واتە (بێگومان ئێوە نازانن کەبیت و بەرەکەتی خواردەمەنی یەکەتان بەکامەوەیە ).

٢. سوپاس و ستایش کردنی خوای گەورە لە کۆتایە دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرموێت ( **ان الله لیرضی عن العبد ان یاکل الاکلة فیحمده علیها** ) رواه مسلم - واتە : (بێگومان خوای گەورە لە بەندەکەی رازی دەبێت کە خواردنێك بخوات و ستایشی بکات لەسەری )

هەروەها یەکێك لەنزاکانی پێغەمبەر (ﷺ ) لەدوای خواردن ئەوە بووە کە دەیفەرموو ( **الحمد لله الذي اطعمني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولاقوة** ) رواه ابوداود و **الترمذي** وابن ماجه و حسنه **الحافظ** والالباني ....

واتە ( هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی دامێ و ڕۆزی دام بەبێ هیچ هەوڵ و توانای خۆم )

● بەرهەم و پاداشتی ئەم نزایە / ئەوەیە هەرکەس بیڵێت ئەوە گوناهەکانی پێشینی هەڵدەوەرێت هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە

کۆی ئەو سوننەتانەی گەر مسوڵمان سورپێت لەسەریان لە کاتی خواردن و پاش خواردن دا لە (١٥) کەمتر نییە ئەگەر سێ ژەم نان بخوات کە زۆرتریش وایە . وەجاری وایە زیاتر دەبێت ئەگەر ژەمەکان زیاتر بن

## سوننەتەکانی ئاو خواردنەوە

١. ناوی خوا هێنان

٢. بەدەستی ڕاست خواردنەوە .

٣. هەناسەدان لە دووری جامەکە یان پەرداخەکە ، بەم ڕەنگە سێ جار ئاوەکە بخواتەوە و لەهەر جارێکیشدا هەناسەیەك لە

دەرەوەی پەرداخەكە بدات . چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوای كردووە هەروەك لە صحيحی مسلم دا هاتووە .

٤. خواردنەوە بەدانیشتنەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( لايشربن احد منكم قائما ) رواه مسلم

واتە(باهیچ كەس لە ئێوە بە پێوە ئاو نەخواتەوە ).

٥. سوپاس و ستایش كردنی خوای گەورە لە دوای خواردنەوەكەوە [1] ( **ان الله ليرضى عن العبد ان ياكل الاكلة فيحمده عليها ويشرب الشربة فيحمده عليها** ) ـ رواه مسلم ـ واتە( بێگومان خوای گەورە لە بەندە ڕازی دەبێت كاتێك خواردنێك بخواتەوە و سوپاسی

[1] تێبینی : سوننەت وایە لەپاش ئاو خواردنەوە ئەم نزایە بخوێنێت ( الحمد لله الذي اطعم و سقى و سوغه وجعل له مخرجا ) . اخرجه السيوطي في الجامع الصغير و صححه الالباني . واتە (هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ ئەو خوایەی كە خواردن و خواردنەوەی دا و ڕێی بۆ خۆش كردووە و دەرچوونیشی بۆ داناوە ).

## کردنی نوێژە سوننەتەکان لەماڵەوە

خوای لەسەر بکات وە کاتێك کە ئاو - یان هەر خواردنەوەیەکی حەلاڵ - بخواتەوە  و سوپاس خوای لەسەر بکات ).

کۆی ئەو سوننەتانەی کەمسولمان جێ بەجێ یان دەکات لەکاتی خواردنەوە دا لایەنی کەم (٢٠) سوننەت دەکات ، وەجاری وا هەیە زیاتریش دەکات ، دیارە ئەو سوننەتانە لە گەڵ هەموو جۆرە خواردەمەنیەکی سارد و گەرم دا جێ بەجێ دەکرێن و تایبەت نییە تەنها بە خواردنی ئاوەوە پێویستە ئاگامان لێ بێت .

---

١. پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دەفەرموێت ( **ان خیر صلاة المرء فی بیته الاالصلاة المکتوبة ) متفق علیه** - واتە (بێگومان باشترین نوێژی بەندە ئەو نوێژەیە کە لە ماڵەوە دەیکات جگە لە نوێژە فەرزەکان ) ـ چونکە نوێژی فەرز فەرزەلە مزگەوت بکرێت یان سوننەتە -

٢. هەروەها دەفەرموێت ( **صلاة الرجل تطوعا حیث لایراه الناس تعدل صلاته علی اعین الناس خمسا و عشرین** ) ـ رواه

ابـو یعلـی و صـحـحـه الالبـانی - واتـه (نوێـژه سـوننەتەکانی بەنـدە لەکاتێکدا کە کەس نەیبینێ پاداشتی بیست و پێنجی هەیە )

٣. هەروەها دەفـەرموێت (**فضـل صـلاة الرجـل فـی بیتـه علـی صلاتـه حیث یراه النـاس کفضـل المکتوبـة علـی النافلـة**) ـرواه **الطبرانی** وحسنه الالبانی - واتـه (چـاکە و ڕێـزی نوێـژی سـوننەتی بەندە لەو کات و شـوێنانەی کـە کـەس نـابینێ وەك چـاکەو فـەزڵی نوێژی فەرزە بەسەر سوننەت دا ).

جاکە وابـوو نوێـژە سـوننەتەکان لـە شـەو و ڕۆژێکدا دووبـارە و چەند بـارە دەبنـەوە ، لـە هـەر جارێـك لـەو جارانـەش دا پێویسـتە بەندە سوربێت لەسەر ئەوەی کە لەماڵەوە ئـەنجامیان بـدات ئـەوە خێرو پاداشـتی زۆری دەسـت دەکـەوێت و سـوننەتی پێغەمبـەریش (ﷺ ) دەپێکێت .

- **بەرهەم و پاداشتی جێ بەجێ کردنی نوێژە سوننەتەکان لەماڵەوە :**

١. هۆکارێکـە بـۆ زیـاد بـوونی ئـیخلاص و ملکەچـی تـەواو و دوورکەوتنەوە لە بەر چاوێنی ( **الریـاء** )) .

٢. هۆکارێکە بۆ دابەزینی ڕەحمـەت و بـەزەیی خـوای گـەورە بـۆ ئەو ماڵە و دوورکەوتنەوە و دەرچوونی شەیتان لێی .

٣. هۆكارێكە بۆ زیاد بوونی پاداشتەكەی ، هـەروەك چـۆن نوێـژی فـەرز لـە مزگـەوت دا خێـری ٢٥ یـا ٢٧ نوێـژی هەیـە ، نوێـژی سـوننەتیش لەماڵـەوە خێـری (٢٥) نوێـژی هەیـە هـەروەك لـە فەرموودەكەدا هاتووە.

## سوننەتی هەستان لە كۆڕو مەجلیس

سوننەت وایە هـەركاتێك لەهـەر كۆڕو مەجلیسێك هەستا بڵێت (**سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لااله الاانت ، استغفرك واتوب اليك**) رواه اصحاب السنن . واتـە ( ئـەی خوایـە پـاكی و بێگەردی و ستایش بۆ تۆیە بەدڵ باوەڕم وایـە بـەزمانیش دەیڵێم و بەكردەوەش دەیسەلمێنم كە هیچ پەرستراوێك جگـە لـە تـۆ داوای لێخۆش بوونت لێدەكەم و بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە) .

بێگومان زۆرن ئەو كۆڕ و مەجلیسانەی كـە مسـوڵمان لـە شـەو و ڕۆژێكدا تیایان دادەنیشێت كە

ئەمانەن :

١. كاتی دانیشتن بۆ هـەر سـێ ژەمەخواردنـە كـە كـە زۆر ترواپـە ئینسان لە گەڵ كە سانێكدا دادەنیشێت .

٢. كاتێك كە دۆسـت و برادەر و دراوسـێك دەبینێـت و گفتوگـۆی لەگەڵ دەكات ئەگەر بەپێشەوە بێت .

٣.کاتی دانیشتن لە گەڵ هاوپیشەکانت لە فەرمانگەو سەرکار و خوێندگاکاندا

٤.کاتی دانیشتن لە گەڵ ئەندامانی خێزانت هاوسەرو منداڵەکانت و براو خوشکەکانت و دایك و باپت کاتێك دادەنیشت و قسەو باس دەکەن .

٥. کاتی ڕێکردن کاتێك کە لەناو سەیارە دای لە گەڵ دۆست و برادەر وناسیاردا یان لەگەڵ هاوسەرەکەتدا .

٦. لەکاتی ئامادەبوونت لەوانەیەکی شەرعی یان کۆڕێك.

جا کەوابوو برای خۆشەویست ـ خوای گەورە بتپارێزێت ـ بڕوانە و بیرکەرەوە بزانە چەند جار ئەم نزاو پاڕانەوەیەت خوێندووە لە دانیشتەکانی شەوو ڕۆژت دا ، بریا هەموو جارێك دەتخوێند بۆ ئەوەی هەمیشە پەیوەندی بەردەوامت لەگەڵ خوای گەورە دا هەبێت .

● ئایە چەند جار ستایشی پەروەردگارت کردووە پاك و بێگەردت کردووە ـ لەو شتانەی کە شایستەی ئەونین ، کاتێك دەڵێت ( ئەی خوایە پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ تۆیە ......)

* ئایە چەند جار داوای لێخۆش بوون و گەڕانەوەت بۆ لای خوای گەورە تازە کردۆتەوە لەشەو وڕۆژێکدا ، وەچەند جار داوای لێخۆش بوونت لە خوای گەورە کردووە لەو هەڵەو تاوانانەی کە

لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا کردوونت، کاتێك دەڵێت ( استغفرك واتوب الیك ) .

* ئایە چەند جار دانت بەیەکتایی خوای گەورەدا ناوە ، یەکتایی لە پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی وناو و سیفەتەکانی کاتێك دەڵێت ( اشهد ان لااله الا انت )

کەوات کرد ئەوە بە درێژایێت شەو و ڕۆژ تۆ لە نێوان یەکتایی خوای گەورە و پاك و بێگەردی کردنی و داوای لێخۆش بوون و گەڕانەوە بۆ لای ئەو دەبێت .

● بەرهەم و پاداشتی جێ بەجێ کردنی ئەم سوننەتە : لێبوردن و هەڵوەرینی ئەو گوناح و تاوانانەی کە لە کۆڕ و مەجلیسە کەدا ڕوویان داوە یان ڕوو دەدەن

● ئیمامی ابن القیم ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەڵێت : کۆ بوونەوەو دانیشتن لە گەڵ دۆست و برادەردا دوو جۆرە :

یەکەمیان : کۆبوونەوە و دانیشتن لە سەرکات بردنە سەر وخۆ خلافاندن ، دیارە ئەمەش زیان و خراپەی زۆرترە لە سوود و چاکەی ، لایەنی کەم دڵ دەمرێنێت، و کاتیش دەکوژێت .

دووەمیان : کۆبوونەوە و دانیشتن لەسەر کۆمەکی یەکتر کردن و ئامۆژگاری کردن لەسەر هۆکارەکانی بەختەوەری و ڕزگار بوون لە سزای خوای گەورە و باسکردن و ڕوونکردنەوەی ڕاستیەکان بۆ

بەکتر ، دیارە ئەمەش باشترین دەسکەوتەو بەسوودترین جۆری کۆبوونەوە و دانیشتنە .

## ئامادەبوونی نیەت پاکی

بزانە خوای گەورە بتپارێزێت . هەرچی کردەوە ڕێپێدراو (مباح[1])ە کان هەیە کە بەندەکان پێی هەڵدەسن و ئەنجامی دەدەن - خەوتن و خواردن و گەڕان بە دوای ڕۆزی حەلاڵ و .......... هتد . دەتوانرێت بکرێت بە چاکە و هۆی نزیک بوونەوە لە خوای گەورە ، کە بەندە دەتوانێت بەهۆی نیەتەوە هەزارەها چاکە و خێر بەدەست بێنێت بە مەرجێك بەندە لەکاتی هەستان بەو کارانە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خوای گەورە بێت ، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ ) دەفەرموێت ( **انما الاعمال بالنيات ، وانما لكل امرىء مانوى** ) رواه البخاري و مسلم - واتە ( بێگومان هەموو کارو کردەوەیەك بەپێ ی نیازو نیەتەکەیەتی ، وە هەموو کەسێکیش پاداشتی بەپێ ی نیەتەکەی دەدرێتەوە ) .

بۆ نموونە : بەندە شەو زوو دەخەوێت بەنیەتی ئەوەی کە زوو هەستێت بۆ شەو نوێژ یان نوێژی بەیانی ئەوە ئەوخەوەی د ەبێتە عیبادەت . هەروەها هەموو کردەوەکانی تر .

[1] مباح : بەو کردەوانە دەوترێت کە نە سزایان لە سەرە ونە جزا .

## زیاتر لە یەك کردەوەی چاك لەیەك کاتدا

دیارە هونەری چاك و جوان مامەڵەکردن لە گەڵ کات دا و ئیستغلال کردنی کات بۆ ئەنجام دانی زیاتر لەیەك کردەوە تێیدا شتێکە تەنها ئەو کەسانە دەیزانن کە پارێزگاری لە کاتیان دەکەن

جا لە ژیانی ڕۆژانەمان دا چەند کاتێك هەن مسوڵمان دەتوانێت زیاتر لەیەك کردەوەی تیا بکات لەوانە :

١. کاتێك مسوڵمان دەچێت بۆ مزگەوت پیادە بێت یان لە سەیارە دابێت ئەوە بێگومان ئەو چوون بۆ مزگەوتەی خۆی لە خۆی دا عیبادەتە ولە سەری پاداشت وەردەگرێت ، بەڵام لە هەمان کاتدا دەتوانێت لە گەڵ ئەو چوونەیدا زیاتر یادی خوای گەورە بکات و قورئان بخوێنێت ، جا ئەگەر وای کرد ئەوە لەیەك کاتدا زیاتر لە یەك کردەوەی چاکی کردووە .

٢.کاتێك مسوڵمان ئامادەی خواردن و دەعوەتی زەماوەندێك دەبێت ـ کە گوناح و تاوانی تێدا نەبێت ـ دیارە ئامادە بوونیش لەم بۆنەیەدا عیبادەتە ، ئەوە دەتوانێت ئەو کاتی ئامادەبوونەی ئیستغلال بکات بەوەی کە چوار قسەی خێر بۆ ئامادە بووان بکات و وەڵامی پرسیاریان بداتەوە ، هەروەها دەتوانێت زۆر یادی خوای گەورە بکات .

٢. هەستانی ئافرەت بە ئەنجامدانی ئیش وکاری ماڵەوەی خۆی لە خۆی دا عیبادەتە ـ بەمەرجێك نیەتی نزیك بوونەوە بێت لە خوای گەورە ـ ، ئا لەم کاتەدا دەتوانێت ئەو کاتی ئیشکردنەی ئیستغلال بکات بەوەی کە لەگەڵ ئیش وکارەکەی دا خەریکی عیبادەتێکی تربێت وەکو یادکردنی خوای گەورە یان گوێ گرتن بۆ کاسێتێکی ئیسلامی .

* ئیبن و عومەر ـ ڕەزای خوایان لێ بێت ـ دەڵێت ( کنا لنعد لرسول الله (ﷺ ) **فی المجلس الواحد مائة مرة ((رب اغفرلی وتب علی انك انت التواب الرحیم** )) رواه ابوداود **والترمذی**ـ

واتە ( ئێمە لەیەك دانیشتندا دەمانژمارد کە پێغەمبەر (ﷺ ) سەد جار دەیوت ئەی پەروەردگار لێم خۆشبەو تەوبەم قەبوول بکە بێگومان تەنها تۆ تەوبە وەرگر و میهرەبانی ))

*بڕوانە و تێبفکرە چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ ) لەیەك کاتدا دووعیبادەتی کردووە

١. یاد کردنی خوای گەورە و داوای لێبوردن لێی .

٢. دانیشتن لەگەڵ هاوەڵانی دا و ڕوونکردنەوەی ئاینەکەیان بۆیان و فێرکردنیان ،

## یادکردنی خوا ( جل جلاله ) لە هەموو کات و ساتێکدا

١.یاد کردنی خوای گەورە بنەمای بەندایەتی بۆ خوا کردنە ، چونکە یادکردن بەڵگەونیشانەی پەیوەندی بەندەیە لەگەڵ

پەروەردگارى لـە هـەمووكات و سـاتێكدا ، خـاتوو عائيشـە ـ رەزاى خواى لێ بێت دەڵێت ( **كان رسول الله** (ﷺ ) **يذكر الله فى كل احيانه** ) رواه مسلم ـ واتە ( پێغەمبەرى خـوا (ﷺ ) يـادى خـواى دەكرد لە هەمووكات و ساتێكيدا ).

جا پەيوەندى لەگەڵ خواى گەورە ژيانە و گەڕانـەوە بـۆ لاى ڕزگـار بوونــە و نزيـك بوونـەوە لێـى بردنـەوەو ڕەزامەنـدى يـە ، وەدووركەوتنەوەش لێى گومڕاى و دۆڕاندنە

٢. يادكردنى خواى گەورە خاڵى جياكـەرەوەى بـاوەڕداران و دوو ڕووەكانـە ، چـونكە سـيفەتى دوو ڕوو ئەوەيـە كـەيادى خـوا ناكـەن بەكەمى نەبێت

٣. شـەيتان ناتوانێـت زاڵ بێـت بەسـەر مسـوڵمان دا لـە كاتێكـدا نەبێت كە لەيادى خواى گەورەبێ ئاگـا بێـت ، چـونكە يـادى خـواى گەورە قەڵايەكى پۆ لاينە ئينسان دەپارێزێت لە فێـڵ و تەڵـە گـەى شــەيتان . بۆيــە شــەيتان پێــى خۆشــە ئينســان هەميشــە خــواى گەورەى لەياد نەبێت و لێى غافڵ و بێ ئاگا بێت .

٤. يـادى خـواى گـەورە تاقـە ڕێـێ بەختـەوەرى و سـەرفرازيە ( **الذين امنوا و تطمئن قلوبهم بذكر الله الابذكر الله تطمئن القلوب** ) الرعد ٢٨ ، واتە(بێگومان ئەوانەى باوەڕيان هێنـاوە دڵ و دەروونيان ئارام دەگرێـت بـەهۆى يـادى خـواوە ئاگـاداربن كەتـەنها بەيادى خوا دڵەكان خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە )

٥. پێویستە زیکرو یادی خوای گەورە هەمیشە و بەردەوام بێت لە هەموو کات و ساتێکدا ، چونکە بەهەشتیەکان لە بەهشتدا لە هیچ شتێك پەشیمان نین لەوەی کەلە دونیا گوزەرانویانە ، لەو سەعات و کاتە دا نەبێت بە سەریاندا هاتووە و یادی خوای گەورەیان تێدا نەکردووە .

بێگومان بەردەوامی زیکر واتە بەردەوامی پەیوەندی لە گەڵ خوای گەورە .

٦. هەرکەس یادی خوای گەورە بکات ئەوە بێگومان خوای گەورەش یادی ئەو دەکات ، خوای گەورە دەفەرموێت:(**فاذكروني اذكركم واشكروا لي ولاتكفرون** ) البقرە ١٥٢ واتە : ( ئێوە یادی من بکەن منیش یادی ئێوە دەکەم ، وە سوپاس گوزاری من بن و ناشوکرمەبن ).

جا ئەگەر ئینسان زۆر دڵخۆش بێت بەوەی کەببیستێت پادشایەك یان کار بەدەستێك لە کاربەدەستان باسی کردووە و ڕێزی لێناوە و ستایشی کردووە ! دەبێت حاڵی چۆن بێت کاتێك خوای گەورە پادشای هەموو پادشایان لەناو کۆڕو کۆمەڵی مەلائیکەتە بەڕێزەکانی چاکتر لەو کۆڕو کۆمەڵەی کە ئەم یادی تێدا کردووە باسی بکات و ناوی ببات .

٧. مەبەست لە زیکرو یادی خوای گەروە ئەوە نییە کە تەنها بەدەم ووشەیەك یان چەند ووشەیەك بووترێت و دڵیش بێ ئاگا بێت لە گەورەی و مەزنی خوای گەورە

بەلکو پێویستە یاد کردنی خوای گەورەبەدەم بێت و بیرکردنەوەی دڵ و مێشکیشی لە گەڵ دابێت و مانا و واتای ئەو ووشانەی دەرەبڕێن کاریگەر بن لەسەر بەندە . خوای گەورە دەفەرموێت ( **واذكر ربك فى نفسك تضرعا و خيفة و دون الجهر من القول بالغد و والاصال ولا تكن من الغافلين** ) الاعراف ٢٠٥ واتە ( یادی پەروەردگارت بکە لە دڵ و دەروونی خۆتا و لێی بپارێرەوە بە نهێنی و بێ دەنگ بەرزکردنەوە ، لە بەیانیان و ئێواراندا و هەرگیز لەو کەسانە مە بە کە غافڵ و بێ ئاگان - یان هەر یادی ناکەن، یاخود دەیکەن تەنها بە زمانە و دڵیان غافلە - )

* کەواتە پێویستە بەندەی **ذیکر** خوێن دڵ و مێشکی بێدار بێ و ئاگای لەو ووشە پڕ مانا و مەزنا نەبێت کە دەریان دەبڕێت بۆ ئەوەی یادی دڵ و زمان پێکەوە کۆببنەوە و بەندەی زیکرخوێن هەمیشە دەرەوە و ناوەوەی پەیوست بێت بەخوای گەورەوە و پەیوەندی بەهێز و بەر دەوامی هەبێت لە گەڵ پەروەدگاریدا .

## بیرکردنە وە لەنازو بیمەتەکانی خوا ( جل جلالە )

پێغەمبەری خوا خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت ( **تفكروا فى الاء الله ، ولا تفكروا فى الله** ) **رواه الطبرانى فى الاوسط و البيهقى فى الشعب وحسنه الالبانى** - واتە : ( بیر لەنازو نیعمەتەکانی خوا بکەنەوە و بیر لە خوا جل جلالە مەکەنەوە ) .

یەکێك لەو شتانەی کە بەردەوام لە گەڵ مسوڵمان داو لەهەموو شەو و رۆژێکدا دووبارە دەبێتەوە هەست کردنە بەناز ونعمەتی خوای گەورە بەسەریەوە ، زۆرن ئەوکات و شوێنانەی کە مسوڵمان لە شەوو رۆژدا دەیان بینێت و دەیان بیستێت کە لەرز دەکەن لەسەر بەندە ووردبێتەوە و بیرکاتەوە لەو هەموو ناز و نیعمەتانەی کە تێدا یە و سوپاس و شوکرانەی خوای گەورە بکات لەسەریان .

١. ئایە هەستت بە نیعمەتی خوای گەورە کردووە بە سەرتەوە کاتێك کە دەچیت بۆ مزگەوت لەکاتێکدا کەسانی دەور و بەرت لەو نیعمەتە گەورەیە بێبەش بوون ، بەتایبەتی نوێژی بەیانی کاتێك تۆ دەچیت بۆ مزگەوت و ماڵە مسوڵمانەکانیش وەکو مردوو وان لە قوڵای خەودا و بێ ئاگان ! !

٢. ئایە هەستت بەنیعمەتی خوای گەورە کردووە بەسەرتەوە کاتێك بەرێگادا دەڕۆیت ئەو هەموو دیمەنە جۆرا و جۆرانەش دەبینیت ، یەکێك تووشی حادیسەی سەیارە بووە و یەکێك تووشی فلاَن گرفت و یەکێك دەنگی شەیتانی(( گۆرانی )) لەسەیارەکەیدا بەرزکردۆتەوە و یەکێك ................ یەکێك ........ یەکێك .......... هتد

٣. ئایە هەستت بەنیعمەتی خوای گەورە کردووە بەسەرتەوە کاتێك دەنگ وباسی جیهان دەبینێت و دەبیستیت ، کۆمەڵێك یان وولاَتێك برسی و یەکێك تووشی لافاو یەکێکی دیکە جۆرە ها

نەخۆشی تێدا بڵاوبۆتەوە و یەکێکی تر بوومە لەرزە و یەکێکی تر شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە و دەربەدەری ......... هتد .

* منیش دەڵێم : بێگومان بەندەی صالح و خواناس ئەو کەسەیە کە هیچ کاتو ساتێك هەستو دڵو دەروونی بێئاگانییە لە نازو نیعمەتی خوا جل جلاله بەسەرێوە لەهەموو کات و ساتێکیدا بۆیە بەردەوام لەسوپاسو ستایش و شوکرانەی خوای گەورە دایە لە بەرامبەر ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی کە تێدایە ، دینداری ، لەش ساغی ، خۆش گوزەرانی ، دوور بوون لە خراپە و بەلاو نارەحەتی ..........هتد

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفرموێت ( من رای مبتلی فقال ((**الحمدلله الذی عافانی مما ابتلاك به وفضلنی علی کثیر ممن خلق تفصیلا لم یصبه ذلك البلاء** )) **رواه الترمذی وقال حدیث حسن** .

واتە :(هەرکەسێك بەلا دارێك ببینێ ویلێت : ( هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ ئەو خوایەی منی پاراستووە لەو بەلایەی کە تووشت بووە وە خوای گەورە رێزی منی داوە بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانی دا، ئەوە تووشی ئەو بەلایە نابێ )

خوای گەورە دەفەرموێت ( **فاذکرواء الاء الله لعلکم تفلحون**))

الاعراف ٦٩

واتـە ( يـادى نـازو نيعمەتـەكانى خـوا بكـەن بـەهيواى ئـەوەى سەرفرازبن )

## خەتم كردنى قورئانى پيرۆز لەهەموو مانگێكدا

پێغەمبەرى خوا ﷺ دەفەرموێت ( اقـرا القـران فـى كـل شـهر ) رواه ابو داود .

واته : ( قورئان بخوێنه ـ واته هەمووى ـ له هەموو مانگێكدا )

چۆنيتى خەتم كردنى قورئـان لـه هـەموو مانگێكدا : بـەم ڕەنگـه هەوڵدات له پـێش هـەر نوێـژێك لـه نوێـژه فـەرزەكان بەئـدازەى ده خولەك ( دقيقه ) يان زووتر ئامادەبێـت بـۆ ئـەوەى لـەو مـاوەى ده خولەكەدا دوو پەڕه واته چوار لاپەڕه بخوێنێت پێش نوێژه كه بێت يان دواى نوێژەكه ، كەوابوو كۆى ئەوەى كـه خوێندووپـەتى لەگـەڵ هەر پێنج فەرزەكه دەكاته (١٠) پەڕه واته (٢٠) لاپەڕه كـه دەكاتـه يەك جزئى تـەواو بەم شێوەيه دەتوانێـت بەئاسـانى هـەموو مانگێـك يەك خەتم بكات [1]

---

[1] ديارە ئەگەر كەسێك له نوێژەكان يەكێكان يان چەندێكيان دوا كەوت يان هەرفرياى جەماعەت نەكەوت يان كارو كاسبى هەبوو ئەوه دەتوانێت لەكاتى تردا بەشى ڕۆژانەى بخوێنێت يان هەر دەتوانێت لـه دواى يـەكێك له فەرزەكان يان هەر كاتێكى تر جزئێكـى تـەواو بخوێنێـت ، بـۆ ئـەوەى

# سوننەتەکانی پێش خەوتن

١. ووتنی ( باسمك اللهم اموت واحیا ) رواه البخاری ـ واته ( ئەی خوایە بەناوی تۆ دەمرم و دەژیم )

٢. هەردوو دەستی کۆ بکاتەوە و ئەم سێ سورەتە ( **قل هو الله احد** ) و ( **قل اعوذ برب الفلق** ) و ( **قل اعوذ برب الناس** ) بخوێنێت و پاشان فوو بکات بەناو هەردوو دەستیدا و پاشان ئەوەندەی بتوانێت بەلاشەی دا بیهێنێت سەرەتا بەسەری دا بیهێنێت پاشان بەدەم و چاوی و پاشان بەلای پێشی لاشەی دا و پاشان بۆ پشتێوە سێ جار ئەمە دووبارە دەکاتەوە .

٣. خوێندنی ئایەتە لکورسی ( الله لااله الاهو الحی القیوم ) رواه البخاری ـ یەك جار

* بەرهەمی خوێندنی ئەم ئایەتە : هەرکەسێ شەو بیخوێنێت ئەوەتا بەیانی دەبێت بە پارێزەری و شەیتانیش لێی‌نزیك نابێتەوە، هەروەك لە صحیحی بخاری دا هاتووە .

---

دوورنەکەوێتەوە لە کلامی پیرۆزی خوای گەورە و بێ ئاگا نەبێت لەو نیعمەتە مەزنە و دڵی نەمرێت بەهۆی دووریەوە لە قورئان .. و

٤. ( **باسمك ربي وضعت جنبي وبك ارفعه ، ان امسكت نفسي فارحمها وان ارسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين** ) رواه البخاري و مسلم .

واتە : (پەروەردگارم بەناوی تۆ کە لەکەم ( لام )) دەخەمە سەر زەوی بەتۆش بەرزی دەکەمەوە ، جا ئەگەر گیانمت کێشا بەزەویت پێدا بێتەوە وە ئەگەر ناردتەوە بۆ نێو جەستەم ئەوە بەوە کە بەندە چاکە کانتی پێ دەپارێزی بیپارێزە ) .

٥. ( **اللهم انك خلقت نفسي وانت توفاها ، لك مماتها و محياها ، ان احييتها فاحفظها وان امتها فاغفرلها ، اللهم انى اسالك العافية** ) رواه مسلم

واتە : ( ئەی خوایە تۆ روح و لاشەمت دروست کردووە و هەر تۆش دەیمرێنیت ، ژیان و مردنی تەنها بۆ تۆیە ، ئەگەر ژیانت بیپارێزە ، وەئەگەر مراندت لێی خۆشبە ، ئەی خوایە من داوای لەش ساغی و پارێزراویت لێدەکەم )

٦. ( **اللهم قني عذابك يوم تبعث عبادك** ) رواه الترمذي وابوداود . واتە : ( ئەی خوایە لە سزای خۆت بمپارێزە لە و ڕۆژەدا کە بەندەکانت زیندوو دەکەویتەوە ) سێ جار دەیڵێت کاتێك دەستی ڕاستی دەخاتە ژێر ڕوومەتی ڕاستیەوە

٧. (٣٣) جار (سبحان الله) و ( الحمد لله ) و سی و چوار جاریش (الله اكبر ) . رواه البخاري و مسلم .

٨. ( **الحمدلله الذی اطعمنا وسقانا و کفانا واوانا ، فکم ممن لاکافی له ولا ماوی** )) رواه مسلم واتە (( هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ ئەو خوایەی خواردن و خواردنەوەی پێ داین و پێویستی پڕکردینەوە و پەناگەو جێی حەوانەوەی پێداوین ، زۆر کەس هەن پێویستیان پڕنەبۆتەوە و بێ پەناگەو شوێنی حەوانەوەن )

٩. (( **اللهم عالم الغیب والشهادة فاطر السماوات والارض، رب کل شی ـ وملیکه ، اشهدان لااله الاانت ، اعوذبك من شر نفسی ومن شر الشیطان وشرکه ، وان اقترف علی نفسی سوء او اجره الی** مسلم ) **رواه** ابوداود **والترمذی ـ**

واتە : ( ئەی خوایە زانای پەنهای و ئاشکرا ، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ، ئەی پەروەردگار و خاوەن و پاشای هەموو شتێك ، بەدڵ پەقینم هەیەو بەزوبان دەیڵێم و بەکردەوەش دەیسەلمێنم کە جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێن ، پەنات پێدەگرم لە خراپەی نەفسم وە لە خراپەی شەیتان و هاوبەش بڕیاردانی ، وە خراپەیەك بەسەر خۆم دا بهێنم یان تووشی مسوڵمانێکی کەم ) .

١٠. ( **اللهم اسلمت نفسی الیك ، وفوضت امری الیك ، ووجهت وجهی الیك ، والجات ظهری الیك ، رغبة ورهبة الیك لاملجا ولامنجامنك الاالیك ، امنت بکتابك الذی انزلت وبنیك الذی ارسلت** ) **رواه** البخاری و مسلم ـ .

واتە ( ئەی خوایە من خۆمم تەسلیمی تۆ کردووە ، وە کاروبارەکانم بەتۆسپاردووە ، وە پەدی خۆمم کردە تۆ ، وە پشتم بەتۆ بەست ، خۆشم دەوێ وابێت دەترسم ، هیچ پەنار جێگای قوتاربوون نین لە چنگ تۆ مەگەر بۆلای تۆ، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کە ناردووتەتە خوار ، وە بەو پێغەمبەرەت کە رەوانەت کردووە )

١١. ( **اللهم رب السماوات السبع ورب العرش العظيم ، ربنا ورب كل شي فالق الحب والنوى ، ومنزل التوراة والانجيل والفرقان ، اعوذبك من شر كل شي انت اخذ بنا صيته ، اللهم انت الاول فليس قبلك شي ، وانت الاخر فليس بعدك شي ، وانت الظاهر فليس فوقك شي ، وانت االباطن فليس دونك الاخر فليس بعدك شي ، وانت الظاهر فليس فوقك شي ، وانت الباطن فليس دونك شي ، اقض عنا الدين واغننا من الفقر** )

رواه مسلم ـ

واتە ( ئەی خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەو پەروەردگاری عەرشی مەزن ، پەروەردگاری ئێمە و پەروەردگاری هەموو شتێك ، دەر هێنەری تۆو و دانەوێڵە، دابەزێنەری تەورات و ئینجل و جیاکەرەوەی هەق لەبە تاڵ ـ مەبەست قورئانە ـ پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپە و زیانی هەموو ئەو شتانەی جڵەو یان بە دەستی تووەیە ، ئەی خوایە تۆ یەکەمین و پێش تۆ هیچ شتێك لە پێش تۆوە نی‌یە ، وە تۆ کۆتایت و هیچ شتێك لە دوای تۆوەنی‌یە ،

وە تۆ دیاریت و هیچ شتێك لەسەرووی تۆوەنی یە ، وە تۆ نادیار و پەنهانی و هیچ شتێك بەبێ تۆنی‌یە ، قەرزار یمان بۆ بدەرەوە و لە هەژاری رزگارمان بکە و دەوڵەمەندمان بکە ) .

١٢.خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (( البقره )) واتە ئایەتی ٢٨٥ ، ٢٨٦ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت

( **من قرا بهما فی لیلة کفتاه** ) رواه البخاری و مسلم - واتە (هەرکەسێك لە شەوێك دا ئەو دوو ئایەتە بخوێنێت ئەوە بەسیەتی).

زانایان لە راڤەکردنی ( بەسیەتی ) لەو فەرموودەیەدا چەند بۆ چوونێکیان هەیە : هەندێکیان گوتویانە : واتا بەسیەتی لەشەو هەستانی بۆ عیبادەت . وەهەندێکیان گوتوویەتی واتە بەسیەتی بۆ پارێزران لە هەموو شەڕ و خراپە و زیانێك .

ئیمامی نەوەویش دەڵێت : دەکرێت مەبەست هەردوو بۆ چوونە کەبێت

١٣. خەوتن بەدەست نوێژەوە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیەکێك لە هاوەڵانی فەرموو ( **اذا اتیت ـ مضجعك فتوضا**) واتە : ( ئەگەر چوویتە سەر جێگای خەوتن ئەوە دەست نوێژبکرە )[1]

---

[1] هەروەها دەربارەی خەوتن بەدەستنوێژە وە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت ( **طهرواهذه الاجساد طهرکم الله ، فانه لیس عبد یبیت طاهرا الابات معه ملك فی شعاره ، لاینقلب ساعة من اللیل**

١٤. خەوتن بەلای ڕاست دا ، پێغەمبەر(ﷺ ) دەفەرموێت ( **ثم اضطجع على شقك الايمن** ) ـ رواه البخارى و مسلم ـ
واتە ( پاشان بەلای ڕاست دا بخەوە ) .

١٥. دەستی ڕاست خستنە ژێر ڕوومەتی ڕاستەوە ، چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) كاتێك بخەوتایە دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتێیەوە . هەروەك ئیمامی ئەبو داود ریوایەتی كردووە .

١٦. جێگاكەی هەڵتەكێنیٚ ـــ تاوەكو دڵنیا بێت لەوەی زیندەوەری زیانبەخشی تێدا نیە بەتایبەتی لەگوندو دێهات و بێستان و شوێنە كشت و كاڵیەكان چونكەزیندەوەریان زۆرترە لەشارەكان ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( **اذا اوى احدكم الى فراشه فلينفض فراشه فانه لايعلم ما خلفه بعده** ) رواه

---

الاثال : اللهم اغفرلعبدك فانه بات طاهرا ) ـ اخرجه السيوطى فى الجامع الصغير و صححه الالبانى واتە(لا شەتان پاكبكەنەوە ـ مەبەست دەست نوێژگرتنە ـ خوای گەورە پاكتان كاتەوە ، بێگومان هەر بەندەیەك شەو بەدەست نوێژەوە بخەوێت ئەوە مەلائیەتێك لە گەڵیدا دەبێت ئەوشەوە لەناو نوێنەكەیدا ، هەرجارێك ئەوبەندەیە ئەم دێ و دیو بكات مەلائیكەتەكە دەڵێت : ئەی خوایە لەم بەندەیەت خۆش بە چونكە بەدەست نوێژەوە خەوتووە ) . بەڕاستی نیعمەتێكی زۆر گەورە یە پێویستە مسوڵمان لەدەستی خۆی نەدات . ـ و ـ .

البخاري ومسلم ـ واتە (ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتەسەر جێگاکەی باجێگاکەی هەڵتەکێنێ چونکە نازانێ لەدوای خۆی چ شتێك هاتووەتە ناو جێگاکەی ) .

١٨.خوێندنی سورەتی ( قل یاایهاالكافرون ) .

* بەرهەمی خوێندنی ئەم سورەتە : ئەوەیە کە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە و پاراستن لەهاوبەش بڕیاردان (الشرك). هەروەك ئیمامی ئەبوداود و **ترمذی** و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە .

ئیمامی نەوەوی ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەڵێت : چاکتر وایە بەندە هەموو ئەو ویردو **ذیکرانە ی** کاتی خەوتن بخوێنێت ، بەلام ئەگەر بۆی نەکرا بەیتوانی هەمووی بخوێنێت ئەوە چاکتر وایە ئەوەی گرنکترە ئەوەیان بخوێنێت . بێگومان زۆرینەی خەلکی لەشەو و ڕۆژێکدا دووجار دەخەون جا ئەگەر ئەم سوننەتانە جێبەجێ بکرێت ئەوە خێرو پاداشتی زۆر بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێت . دیارە ئەم سوننەتانە تایبەت نین بەخەوتنی شەوە وە بەلکو بۆهەموو خەوتنێکە لەشەودا بێت یان لەڕۆژ چونکە فەرموودەکان گشتین .

● بەرهەمەکانی جێبەجێ کردن ئەم سوننەتانە :.

١. ئەگەر بەندە پارێزگاری بکات لەم زیکرو ویردانە ئەوە ( ١٠٠ ) خێری بۆ دەنوسرێت چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت ( وتنی هەر (( سبحان الله )) یەك خێر و چاکە یەکە ، وەهەر ((الله

اكبر )) يێكيش خێرێكە وە هەر (( الحمد لله )) يێك خێركە ، وە ووتنى هەر ((لااله الاالله )) يێك خێرێكە ) ئيمامى مسلم ڕيوايەتى كردووە

(١) ئەگەر مسوڵمان پارێزگارى بكات لەم زيكرو يردانە، ئەوە (( ١٠٠ )) درەختى لە بەهەشت دا بۆ دەڕوێت ، هەروەك فەرموودەكەى پێغەمبەرمان (ﷺ) باس كرد لەباسى سوننەتەكانى دواى نوێژە فەرزەكان .

(٢) پاراستنى خواى گەورە بۆ بەندەكەى ، هەروەها دوور كەوتنەوەى شەيتان لێى لەو شەوەدا و پاراستنى لە هەمووشەڕ و خەراپە و زيانێك .

(٣) ئەگەر بەندە ئەم زيكر و يادانە بخوێنێت ئەوە ئەو ڕۆژەى كۆتايى پێهێناوە بە زيكرى خواى گەورە و كوێڕايەڵى كردنى و پشت بەستن بەو و داواى يارمەتى كردن لەو و يەكتايى ئەو .

# کـــۆتـــایـــی

ئەوەی کە ماتووە لە دوو توێی ئەم نامیلکەیەدا کورتەیەکە دەربارەی ئەو سوننەتانەی کە لە شەو و ڕۆژدا دووبارە دەبنەوە ئەوەندەی بۆمان کرا بێت کەکۆی کەینەوە .

داوا کارین خوای گەورە لەسەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) بمانژێنێت و لەسەر ڕێبازی ئەویش بمانمرێنێت .

واخر دعونا ان الحمدلله رب العالمين .

*********************

بێگومان رێز و پلەی ئیماندار بە پێی شوێنکەوتنی بۆ پێغەمبەر ( ص ) هەرکاتێك سوننەتێك زیاتر جێبەجێ بکات ئەوە لای خوای گەورە بەرز و زیاتر دەبێت.

بیرکەرەوە و تێبفکرە لەوەی ئەگەر یەکێك لە ئێمە ئەندازەیەك مالی لێوون بێت زۆر خۆی بۆ ماندوو دەکات و هەوڵ و کۆششی زۆر دەکات بۆ گەڕان بە دوای دا و دۆزینەوەی بە دەست هێنانەوەی تاوەکو دەستی دەکەوێتەوە بەڵام زۆرن ئەو سوننەتانەی کە وون بوون لە ژیانماندا . بەڵام هیچ غەم و خەفەتێك و هەوڵ و کۆششێکمان نییە بۆگەڕان و دۆزینەوەی ئەو سوننەتانە و جێ بەجێکردنیان لە ژیانی رۆژانەماندا؟؟!!

لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی یاودران

ژمارەی سپاردنی ( 301)ی ساڵی 2003ی پێدراوە.